خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن خەمڕەوێن

بولبولی چاو مەست هاودەمی گوڵ    بێ خەم و خەفەت دانیم گەش دڵ

نووسەر :

**محەممەد ئەمین ئەمینیان - سەردەشت**

ناوی کتێب : خەمڕەوێن
نـووســەر : محەممەد ئەمین ئەمینیان - سەردەشت
بڵاوکەرەوە : نووسەر
پـیـتـچـن : دۆلان
ژمـــاره : ۱۰۰۰
چـــاپ : یەکەم
نۆبەی چاپ : چاپی یەکەم ۱۳۹۱- ۲۰۱۲
نـــــرخ : ۴۰۰۰ تمەن

**ئەم پەڕتووکەیە پێشکەشە بە بەڕێزان**

**«کاک ڕەحمانی برام» و «مامۆستا مەلا محەممەدی شلّماشی»**

دیـارە ئـەوانیش زۆر مـەجلیس ئـاران     یـارەب بێـوەی بـن هـەتا لـە ئـاران

ئەمین گەلەکەت دائیم دڵشاد بێ — بە خەم، خەم نەبێ و منی لە یاد بێ

خوایە گەلەکەم هەر بەختەوەر بێ — لە بەندوڕکەی خەمان ئازاد بێ

# .: بەشی ١ :.

بەناوی ئەو خوایەی کە لابەری خەم و پەژارەیە

## پێشەکی نووسەر

خوێنەری بەڕێز و هێژا! دیارە لە کۆنەوە تا بە ئەمڕۆ نەقڵ و جەفەنگی خۆش و گەشە و نەشەبزوێن و خەمرەوێن لە کوردەواری ئێمەدا باو بووە و لە گەڕدا بووە. بێگومان ئەمەش کارێکی جوان و پەسندی گەلەکەمانە بۆ رازاندنەوەی کۆڕ و مەجلیس و لابردنی خەم و پەژارە لەسەر دڵی خەفەتباران؛ تەنانەت لە کوردەواری ئێمەدا مەلا و فەقییانی ئاییینیش بەرنامەی جەفەنگ و شۆخیان بۆ کۆڕی ئیجازەنامە و ودم وەرگرتن پێک دەهێنا. لە بیرمە جارێکیان مەلا سەعیدیان راست کردەوە بۆ وتار خوێندنەوە، ئەویش هەر لە خۆوە قسەی بۆ جەفەنگ و پێکەنین هەڵدەبەستن و دەیگوت :

ایهاالقوم الان استکو، لا تکان، الجازه للعجوزه ... واتە ئەی خەلکینە گوێ بگرن، بێدەنگ بن، بزانن پیرێژنێک ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ. دیارە لە هەر ناوچە و وڵاتێکدا چەند کەسێکی تایبەتی بوون کە کۆڕ و کۆمەڵرازاوە و قسەخۆش و بابەتی جەفەنگ بوون. بۆ نموونە لە وڵاتی سەردەشت هەر بە بیری من چەند نەفەرێکی ئاوامان هەن وەکوو عەوڵای رەحیم پیرۆزی و کوێخا عەوڵای بێژوێ و کاک رەحمانی ئەمینیان و وەستا عەوڵای میراوێ و مام رەسوولی هەلۆێ و مەلا رەحمانی شینوێ و مەلا حەسەنی عەلی پوور. بە راستی لەبەر گرنگی ئەم نەقڵ و قسە خۆشانەیە کە هێندێک لە نووسەران وەکوو عەلائەددینی سەججادی و مەلا محەممەدی شلّماشی هاتوون بە زەحمەتێکی زۆرەوە بەرهەمی ئەو چەشنە کەسانەیان کۆ کردۆتەوە و بە شێوەی پەڕتووک دەریان هێناوە و چاپ کراوە و بۆتە کەلتوور و کەلەپوورێکی باش و بە نرخ بۆ وەچەی دوای خۆیان. هەر وەها **ربیع‌الابراری عەللامەی زمەخشەری** و **کەشکۆلی شێخی بەهایی** و **دیوانی سەعدی مەنسووری** و **چێشتی مجێوری هەژاری** پڕن لەم نەقڵ و باسانە. بەشەر لە ماوەی ژیانیدا بۆ لەزەتی گیانی پێویستی بە زۆر شت هەیە. بازێک لە وشکسروشتەکان دەڵێن جا ئەوە چ دەردێکی ئێمە دەرمان دەکات. دەبێ بڵێین ئەوانە بە هەڵە داچوون و بێخەبەرن لە مێژوو. ئەگەر کەسێک تەماشای مێژوو بکا، بۆی دەردەکەوێ کە نووسەرە بەڕێزەکان و پیاوانی هەڵکەوتووی جیهان، قسەی خۆش و جەفەنگیان بووە.

دەگێڕنەوە جارێک پێغەمبەری مەزن لەگەڵ ئیمامی عەلی خورمایان دەخواردن، حەزرەت بە شۆخی دەنکە خورماکانی خۆی داوێتە سەر دەنکە خورماکانی حەزرەتی عەلی، کە لێبوونەوە حەزرەت بە عەلی گوت: کێهەمان خورمای پتر خواردن؟!!

عەلی گوتی: ئەو کەسەی دەنکەکانی لەسەر ئێمن دادەنان! حەزرەت زەردەخەنەیەکی کرد.

ئەوەیە کە گوتراوە اَلهَزْلُ مِلحُ الکَلَامِ واتە جەفەنگ و شۆخی تام و خوێی قسانن.

بە راستی پێکەنین و گریان کە شتێکی سروشتین هەر دووی ئەو دوانە بە جێی خۆی بۆ مرۆڤ پێویستن بە تایبەت لە بواری ڕەوان ناسییەوە. کە وابوو قسە و نەقڵی خۆش بۆ فەرد و کۆمەڵ هۆی حەسانەوەی ماندوویی مێشک و ئارامی دڵن، بە قەولی سەعدی:

نگویم لب ببند و دیده بر دوز ولیکن هر مقامی را مقالی

زمانی بحث علم و درس و تنزیل که باشد نفس انسان را کمالی

زمانی شعر و شطرنج و حکایت که خاطر را بُود دَفع ملالی

* * *

جهان چون خط و خال و چشم و ابروست که هر چیزی به جای خود نیکوست

* * *

دەڵێن دوو نەفەر بوون کە یەکێکیان هەمیشە پێدەکەنی و ئەوەکەشیان هەر دەگریا. کابرایەک پێی گوتن: نە هەمیشە گریان باشە و نە هەمیشە پێکەنین، من بەش بە حاڵی خۆم لەگەڵ دۆستان تەنانەت لە سوخەنڕانیشدا نەقڵی خۆشم بووە.

بە هەر حاڵ بازێک لە دۆستان پێشنیاریان پێکردم کە ئەو نەقڵانە کۆ کەمەوە، هاتم دەستم بەکار کرد کە زۆرێک لەم نەقڵانە بیرەوەری خۆم و ئەو کەسانەن کە ئەهلی شۆخین؛ وە هەیە کەمتاکورتێک لەو نەقڵانەی کە لە پەڕتووکەکانی دیکەدا ئیستیفادەم کردووە. با ئەوەش بڵێین لە گێڕانەوەی ئەم نەقڵانەدا مەبەستمان تەنیا هەر پێکەنینی رووت نییە، بەڵکوو وەرگرتنی پەند و ئامۆژگارییە لەگەڵ نەتیجە وەرگرتن لە هەر یەک لەو نەقڵانە. دیارە ئەم پەڕتووکەیەش لە هەڵە و پەڵە خاڵی نییە، دەبێ بە گەورەیی خۆتان لێمان ببورن، بەڵێ «کاڵا لە قەد باڵا»، «خەتایە گەر بڵێم میسکی خەتایە.»

تێبینی :

لە وانەیە بازێک لە خوێنەران رەخنەیان هەبێ و بڵێن فڵانکەس ریعایەتی ئەدەبی نەکردووە لە نووسینەوەی هەندێک نەقڵ و وشەدا. لەگەڵ رێزم بۆ رەخنەکەیان دیارە نووسینەوەی ئەم بابەتانە دەبێ زەق و بەرچاو وەنووسرێن «بە قەولی کوردی قسەی خۆش نابێ وەبن بەرێ دەین.» ئاشکرایە کە نووسەرانی دیش لە گێڕانەوە و نووسینەوەی قسەی خۆش و تەنز و جەفەنگ پارێزیان نەکردووە، بە قەولی هێمن : «ئەمن دەیڵێم و بێباکم بۆ روون بوونەوەی مەبەست.»ساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی لە گوندی بێژوێ میوانی شێخ مەلا عەلی[1] بووم، رێکەوت باقلەیان هەبوون، بۆیان هێنایین دەستمان کرد بە خواردن، ئەمن بە شەرم و تەقیەوە دەمخواردن، شێخ گوتی فڵانکەس باقلە بە نەجیبی ناخورێن دەبێ خۆیان لێ ناشیرن بکەی، بە هەرحاڵ با نەبێتە درێژدادڕی (عارفان حرفی بس.)

بە سپاسەوە هەر خۆش و بەختەوەر بن، دڵسۆزی گەل و نیشتمان

محەممەد ئەمین ئەمینیان

سەردەشت

---

١ - ئەو بەڕێزە پیاوێکی زۆر باش و ئەدەبدۆست بوو، ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی لە شاری سەردەشت کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ مەولانە بە خاک سپێردراوە.

چنان زی ذکرت به تحسین کنند چو مردی نه بر گورت نفرین کنند

سعدی

# .: بەشی ٢ :.

«سەرنامە بە ناوی تۆ خودایە — چی بێ ئەمە پیت و پێزی نایە
بێ ناوی تۆ نامە هیچ و پووچە — ئەتنووسێ بنووس کەچ و کرووچە
گیان تیشکی پریشکی تۆیە روونە — گوڵ کە تیشکی لینەدا زەبوونە»

## پێشەکی بە پێنووسی هێرش بێتووشی

لە بەرەبەیانی مێژووەوە قسەی خۆش و نووکتەی بە تام وەک باڵێکی ئەدەبی سەرزارەکی شەوچەری دیوان و باوەشێنی دڵان بووە و سەری بە ماڵی حەز و تاسەی هەمواندا کردووە. بە تایبەت رۆژگارێک کە بە هەر هۆیەک بێ، دەستەی خوێندەواران لە ناو گەلی کورد دا کەم بووە و لە دەڤەرێکی وەکوو ئەم مەڵبەندەی ئێمەدا (ناوچەی سەردەشت)رەنگە لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێنەپەڕیبێ، بەشینەوەی زانایی و پاشەرۆکی نووکتەی بە چێژ و قسەی خۆش لە رێگەی فێربوون و فێرکردنی ئەو شێوە ئەدەبەوە بووە. خەڵکی تامەزرۆیانە لە دەوری یەک کۆ بوونەتەوە و لە توێی نوکتەی بە تام و حەکایەت و قسەی ئەستەقدا بۆ پێکەنین و هەندێ جار بۆ تانە و تەشەر لێدان لە چەوسێنەران و زاڵمانی سەردەم، کوڵی دڵی خۆیان بەو شێوازە رشتووە و پشکۆی ئەو کوانووەیان بە گەشاوەیی هێشتووەتەوە. بەڵام لە رۆژێکەوە خوێندنەوە و نووسین هاتە ئارا و پەرەی ئەستاند، ئەو شێوە ئەدەبە باوی نەما. لە لایەک ئەوەندە زارەوزاری پێکرا و لە زمانانداا سوا کە تام و چێژی خۆی لە دەست دا و لە توێی پەردەی شەرم و شوورەییدا شارایەوە، لە لایەکی تریشەوە بە هۆی نووسینەوەی بە زمانی زاڵ، لەوەندیش بووکە بوو.

راستە کە خوێندن و نووسین چرای رووناککەرەوەی شەوەزەنگی تاری هەر گەل و وڵاتێکە و ئاسۆی بەختیاری لەو دەروەوە رۆشنایی بە بوون و مانی نەتەوەیی دەبەخشێ، بەڵام گەلێک کە بە زمانی خۆی نەخوێنێت و بەرهەمە ئەدەبیەکانی بە رێنووس و زمانی زگماکی خۆی نەنووسێتەوە، وێڕای ئەوە کە سوودێکی ئەوتۆی پێ نابڕێ، مایەپووچیش دەردەچێت و ئەستێرەی هاتی دەکەوێتە پەساری نەهاتی و بوولێلەیەکی مەترسیدار باڵ بە سەر داهاتوویدا دەکێشێ. هێندی هێندی وشە زاڵەکان جێ خۆش دەکەن، پاڵەستۆی وشە خۆماڵیەکان دەدەن و لە ئەنجامدا شوێنیان دەگرنەوە. تەنانەت لە هەندێ بواردا رەنگ و رواڵەتی بەرهەمەکە وا

دەگۆڕدرێ خاوەنەکەی نایناسێتەوە و بگرە بۆنی بیانی لێ دەکات. ئەوەش هێمای نەمانی زمانە و هەر گەلێکیش زمانی زگماکی نەما، نامێنێ.

بەڵام چونکوو فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لە توێی ئەو بەسەرهات و بەند و باوانەدا پشتاو پشت هاتووە ومەودای لاواز بوونی نەدراوە، لە چاو زۆربەی ئەو گەلانەی کە دەستی زۆر نووسینی لێ داگیر کردوون باشتر پارێزراوە. وێڕای ئەوەش بە هۆی پابەندی و دڵبەندی گەل بە کولتووری نەتەوایەتی و رابردووی پڕشنگدار و دیاری کوردییەوە، بواری ئەوە نەدراوە تێکەڵاوی فەرهەنگە زاڵ و بیانیەکان بێت و بە بێگەردی ماوە. یەک لە دوای یەک دڕ بە تووشیەکانی تووشهاتووی سەر ڕێگای دراوە و وەک سۆمای چاو بە پاکی هێڵدراوەتەوە و ئەوەش بە بەر چاو جیهانەوە دیارە.

بۆ ئەو مەبەستە گرنگەش هەر یەک لە نووسەران و هۆنەران و هونەرمەندانی گەلەکەمان هاوتا لە گەڵ بەیتبێژ و نەقڵباز و حەکایەت خوانەکان لە بێشکەی دارەوە تا بێشکەی خاک هەر یەک لە ڕێگای خۆیەوە چاکی ئازایەتی و بەرپرسایەتی زمانپارێزیان بە لادا کردووە و لە کۆی سەردەمەکاندا ئەرکی سەر شانی خۆیان بە جوانی بە ئەنجام گەیاندووە.

یەکێ لەو دڵسۆزە ئەمەگناسانەی گەل و وڵاتەکەمان نووسەری ئەم پەرتووکەی بەر دەستتانە کە بوێرانە گوێی نەداوەتە سەرکۆنە و لۆمەی ئەم و ئەو و ئازایانە قۆڵی سام و نەترسی لە نووسینی نووکتە خۆش و بەسەرهاتە بۆهاتەکانی خۆی و خەلکی هەڵماڵیوە و وێڕای پاراستنی واتای ئەدەب، زۆر ڕووداوی سەیر و پێکەنیناوی تێدا گونجاندووە، هەروەها ژیری بیر و لێهاتوویی گەلەکەشی پیشان داوە.

ئەم نووکتانە ڕەنگە لە ڕواڵەتدا ساکار و کەمبایەخ بنوێنن و وەکوو پێویست بە دڵی هەمووانەوە نەنیشن، بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنجیان بدرێتێ لە واتادا دەوڵەمەند و زۆر لایەنی وەک وڵاتپەروەری، بەشەردۆستی، دڵپاکی، ئاکار چاکی، ئامۆژگاری گەشت و گەڕان بۆهۆبە و هەوار و هەندەران، پاڵ وەدنیا نەدان و دنەدانی لاوان بۆ خوێندن و دانایی، گرنگی دان بە کەسایەتی مەزنان و زیندوو ڕاگرتنی کولتووری تێ دایە و لە هامان کاتیشدا باوەشێنی دڵانە.

بەو هیوایە جێگای ڕەزامەندی خوێنەرانی بێت.

هێرش بێتووشی

سەردەشت

٢٧ی خەرمانانی ساڵی ٢٧١٠ ی کوردی

# .: بەشی ٣ :.

با دەست پێکردنی پەڕتووکەکەمان بە نەقڵی یەکێک لە گەورە پیاوانی هێژا و شاعیری نەمری گەلەکەمان مامۆستا هەژار برازێنینەوە. دەڵێن مامۆستا هەژار میوانی مەلایەک دەبێ، لەدوا بەخێرهاتن لێی دەپرسێ ناوت چییە؟ دەڵێ نێوم هەژارە. مەلاش پێی دەڵێ: «بێ (هێ) ژاری، بێ (ژێ) هاری؛ واتە ژار مەبە و شیرین بە، هار مەبە و ئارام بە، چەقڵ مەبە و گوڵ بە» بە خۆشییەوە مامۆستا هەژار هەموو ژیانی خێر و بەرەکەت بوو بۆ گەل و نیشتمانی لە ناو گۆڕیشیدا گیانی شاد و بێوەی بێ.

دەڵێن کاتێک کە «هەژار» و «هێمن» فەقێ دەبن، رۆژێکیان درەنگ دەچنەوە بۆ دەرس، مامۆستاکەیان لێیان توورە دەبێ و دەڵێ کەچەڵ و قاف و واو و نوون دەرینە لە کوێ بوون؟! هێمن خێرایەک جەمەدانە و کوڵاوەکانی دادەنێ و دەڵێ قوربان ئەمن کەچەڵەکەم، لە راستیدا هێمن کەچەڵ بووە.

هـێمن ئـەم بولبولـە سـەر بـێتووکـە　　　چییە کە لێی نایە چ جووکـە و نووکـە

لێرەدا حازرجوابی مامۆستا هێمن زۆر خۆش بووە و مامۆستا هەژاریش لە دڵی گران نەهات، چونکە شۆخیان پێکەوە هەبووە، هەروەها مامۆستاکەشیان لە رووی خۆشەویستی و دڵسۆزیەوە ئەو جنێوەی پێدان؛ چونکە بە راستی کات و وەخت زۆر بە نرخن، کەوابێ ئینسان نابێ ئەو هەل و فرسەتە زێڕینە بە فیڕۆ و بە بەتاڵ لە دەست خۆی بدات، بەڵکوو دەبێ بە فێربوونی عیلم و سەنعەت، کار و کەسابەت، بە عەمەل و کردەوەی باش خۆی خەریکی خزمەتی گەل و نیشتمان بکات. شافیعی دەڵێ :

مَنْ فَـاتَـهُ التَّعْلِيـمُ وَقْـتَ شَبَابِهِ　　　فَـكَـبِّـرْ عَـلَيْـهِ أَرْبَـعًا لِـوَفَـاتِهِ

واتە هەر کەسێک کاتی خۆی بە فیڕۆ بدا و لەگەڵ عیلم و زانین خەریک نەبێ، لەگەڵ مردوو جیاوازی نییە.

هەروەها سەعدی دەڵێ :

بیفایده هر که عـمـر در بـاخت　　　چیـزی نخریـد و زر بینـداخت

زانسـت چرایـە و چـرای رزگـاری　　　هـەر گـەلێ نـەیبێ کـراوە کـاری

ئـەو چـرایەی هـەرگیز ناکوژێتـەوە　　　بـێ ئـەو هـیچ گـەلێ نابووژێتـەوە

ئـەمین گەلەکـەت هـەتاکوو مـردن　　　هان بدە بـۆ رێی زانـست و خـوێندن

# .: بەشی ٤ :.

دەڵێن پیاوێک خێزانی دەمرێ، کاتێک کە مەلا تەلقینی دەدا، خاڵە پیرە دەڵێ مەلا ئەرێ ئەو ئەنتە و فەنتەت لە چییە، ئەوە خێزانی من بوو حەفتا ساڵی بە کوردی پێم دەگوت چێشتی بێ خوێ لێنێ، بۆم حاڵی نەکرا و هەر سوێری لێدەنا. ئێستا ئەتۆ دەتەوێ بە مردوویی و بە عەرەبی حاڵی بکەی.

دیارە هەر وەکوو ژنی گێل و ناحاڵی هەن، پیاوی گێل و ناحاڵیش زۆرن. بۆ نموونە جارێکیان کابرایەکمان میوان بوو، بەیانی ویستی بڕواتەوە کەچی ئێوارێ پەیدا بۆوە، گوتم مام فلان خۆ گوتت دەچمەوە، گوتی وەڵڵا هەتا ئێوارێ لەوێ بووم کەس نەیگوت وەرە سوار بە، بە هەر حاڵ لەم نەقڵەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئینسان مرد، تازە دەفتەری حیسابی تەواو دەبێ و ئیدی خۆی و خورجینی خۆی، هەر وەکوو شاعیر دەڵێ :

| | |
|---|---|
| وا بمرن کە وا لێو نەکەن نەفرین | لە دوا مردن و بەلکوو بۆو بگرین |
| پیاوانە بژین پیاوانە بمرن | لە شایی و لە شین دەستی یەک بگرن |
| هەر چاکە چاکە بۆ رۆژی تینت | دەرمانت ناکا سا گەرمەشینت |
| ئینسان لە ماوەی ژین و ژیواری | ئەگەر چاک نەبێ، کراوە کاری |
| مرۆڤی لەشەڕ، هەر شەڕە بەشی | خۆراکی مار و دووپشکە لەشی |

لە هەولێر بووم، برادەرێک پێی گوتم فلانکەس خەجاڵەتم، خێزانەکەم نەخۆشە نەینا دەعوەتم دەکردی، گوتم (سبحان الله) ئەمنیش بە دەردی تۆ گرفتارم، بە خوا بێی بۆ سەردەشت ئەمنیش خەجاڵەتی تۆ دەبم و ناتوانم دەعوەتت کەم، ئەوەیە کە دەڵێن : «جوابی تەعای، پەعایە».

دەڵێن «حاتەمی تایی» کە ناسراو بوو بە سەخاوەتی، کابرایەکی دەوڵەمەند گوتی بەتاقی دەکەمەوە ئاخۆ وەک دەڵێن راستە. گۆیا ئەسپێکی شەش دانگی هەیە، نەفەرێک دەنێرم بۆ لای ئەگەر ئەو ئەسپەم بۆ بنێرێ ئەوە هەر چۆنێک بڵێن ئاوا سەخییە.

بە نەفەرێکی گوت بچۆ بۆ لای حاتەم تایی، بڵێ فلانکەس ناردوومی بۆ فلان ئەسپ. کابرا وەڕێ کەوت. دوای چەند رۆژ گەیشتەوە ماڵێ حاتەمی. شەوێ لەوێ بوو، بەیانی کە لە خەو

هەستان کابرا گوتی : قوربان ئەمن فلان کەسی ناردومی بۆ لای تۆ بۆ فلان ئەسپی کە بە دیاری بۆی بنێری. حاتم گوتی بەداخەوە بۆ ئێواریّ کە دەهاتی دەنگت نەدەکرد، وەڵلا بۆ تۆم سەر بری، کابرا سەری سوڕما و گەڕایەوە بۆ لای گەورەکەی و ئەو نەقڵەی بۆ گێڕایەوە، کابرا زۆری پێ سەیر بوو، گوتی مادام ئەو دڵی هاتبێ بۆ تۆی سەر بڕێ، لە سەتاسەت دڵی دەهات کە بۆ منی بنێری، ئافەرین بۆ هیممەت و سەخاوەتی، کراسە و بە بەژن و باڵای بڕاوە.

دیارە ناندان دڵی دەوێ و کاری هەموو کەس نییە، بە قەولی کوردی : «هەرچی سمێڵی سوور بوو هەمزاغا نییە». ئەوەیە کە خاجە عەبدوڵڵای ئەنساری لەو بارەوە گوتوویەتی :

«نماز کردن کار پیرزنان است، روزە داشتن صرفە نان است، حج رفتن تماشای جهان است، نان دادن کار مردان است». دیارە دەوڵەمەند دەبێ دەست و دڵباز و بەخێر و بێر بێ بۆ خۆی و بۆ گەل. لەو بارەوە دەڵێین :

رۆژانــە بــە رۆژوو بــی و شــەوانــە خــەریــکی نــوێــژ
بــۆ دروســت بــوونــی ئــەوانەش زۆر بکەی پرس و راوێـژ

هـەمـوو سـاڵێک حەج بکەی و بڕۆی بـەرەو خـاکـی حیجـاز
مـەلـی خـانوچـکەی دڵـت بـەرەو کـابە بـکـا پــەرواز

لـە مــەدیـنە تـابـە کـابـە بـە پێخواســی و بـە سـەری رووت
بــە ئــەمینی وەرێکـەوی و کــەس نـەوێـریّ بێتــە رووت

لێـوەکـانـت بــە لـەبـەیـکـە تــا دەگـاتـە لاشـەریــک
هــەر لــە گــەڕ بــن رانــەوەسـتن هــەر خــەریــک

لــە مـزگـەوت و لـە هـەر شوێنێ هەر خەریکی خوا پەرستی
بـە شـەو نـوێژ و ویـرد و ئـەوراد، هەر خەریک بی رانەوەستی

خــۆت بـپـارێــزی هــەمیشـە لـە تـاوان و خــەتـاکـاری
هـەتـا دوور و ســەلامەت بــی تــۆ لــە تـۆلـەی زاتی باری

هەمـوو شــەوێک شـەوی هـەینی لەگەڵ یەزدان بە راز و نیـاز
هـەتا رۆژ چـاوت بـێخەو بـێ و لـەبەر یەزدان نــەبی بێواز

سوێند بەو کەسەی بێهاوەڵ و تاک و تەنیا و پاک و بـێشـوێن
هیچیان لـە وانـەی بـاس کـران بـە سـەرنجـەوە لێیان بــدوێن

خێریـان ناگاتــە ئــەو خێـرە کــە دەرگــای خێـرت والآ بێــت
لەسەر مرۆی برسی و هــەژار کـە مەبەسـتت ڕەزای خـوا بێـت
نــەک لــەبەر وەی کــاری پــێ بکەی چـاو لەژێر بێ و بیبــەزێنی
گــەر مــەبــەستت واتــە وابــێ خــۆبــەزیــن و خــۆتــەزێنــی
«ئــەمیــن» فـیـدای مـرۆی وابــێ کــە پشتـگـیـری هــەژارانــە
بــە راستــی دوور و بــێزارە لــەوەی بــێخێـر و بــێنــانــە

# .: بەشی ۵ :.

دەڵێن پیاوێک هەبوو پێیان دەگوت مامە خەمە، چونکە خۆی بە هەموو شتێکەوە ماندوو دەکرد و قەت بێخەم نەبوو، ڕۆژێکیان گوتی وادیارە ئەمڕۆ هیچ خەمێکم نییە با هێلکە و ڕۆنێک دروست بکەم و بیخۆم. هێلکە و ڕۆنی ساز کرد و هێنای کە بیخوا، بانگیان کرد هۆی مامە خەمە! ماڵی فلانکەس گوێدرێژەکەیان جاشکۆلێکی بووە کلکی نییە، لە خەفەتان نانی بۆ نەخورا.

لەو نەقڵەدا ئەو دەرسەمان دێتە دەستێ کە ئینسان نابێ بە خەم و خەفەتان خۆی بکوژێ و دونیا لە خۆی وە تەنگ هەڵێنێ و خۆی تووشی نەخۆشی گیانی و بەدەنی بکات، بەشەر لە ماوەی ژین و ژیواریدا تووشی تەنگ و چەڵەمە و هەر ڕووداوێکی خۆش و ناخۆش دەبێ. دەڵێن پیاوێک چاوی بە ژنێک کەوت کە زۆر بە کەیف و خۆشحاڵ بوو، گوتی خۆزگە منیش وەکوو ئەو بێخەم بوومایە، کابرا لە ژنەی پرسی گوتی خوشکی بەڕێز وادیارە کە تۆ زۆر بێخەمی. ژنەکە لە وڵامدا گوتی هەمووی دوو مانگ نابێ کە مێردەکەم و دوو کوڕم بە دوو یەکدا مردوون، ئایا ئەوە ڕووداوێکی تاڵ و دڵتەزێن نییە؟ بەڵام ڕەزا بە قەزام و سابیر و خۆڕاگرم، گوتم ئافەرین بۆ تۆ هەی شێرەژن.

بەڵێ ئەوزاع و ئەحواڵی مێژوو دێت و دەڕوا. جارێک بە مەیلە و جارێک بێ مەیلە، دەبێ لەگەڵی بسازێین.

دەڵێن جارێکیان پیاوێک لە بازاری بە لای ژنێکی ماستفرۆشدا دەڕوا، دەڵێ : پووری کیتەڵە و میتەڵەت بەچەندی؟ پووریش لە وەڵامدا گوتی کیتەڵەکە بە هەزار تمەنی و میتەڵەکەش بە ریشت. دیارە جوابی تەعای پەعایە، ئەگەر کابرا ئاگای لە زمانی خۆی بوایە و ریعایەتی ئەدەبی بکردایە تووشی ئەو جەوابە نەدەبوو، ئافەرین بۆ پوور و داوەشێنیش بۆ خاڵ. هەر لە سەر ئەم نەقڵە دەڵێن جارێکی ژنێکی جوان زۆر بە خێرایی بە ڕێدا دەڕوا، گەنجێک پێی

گوت : خوشکێ هێواش برۆ با مەقەستەکەت نەسوێ. ئافرەتەکەش لە وڵامدا گوتی : خەمی مەخۆ، بەشی بەر سمێڵی تۆی پێوە دەمێنێ. کابرا خەجاڵەتی نەبێ پێی نەمابوو، وەک گوتوویانە «ئەگەر زمان لێگەڕێ سەر راحەتە»، هەروەها شاعیر دەڵێ :

ادب تاجی است از لطف الهی    بنه بر سر برو هر جا که خواهی

لە لوقمانیان پرسی: «ادب از که آموختی؟ گفت: از بی ادبان؛ هر چه ایشان کردند من نکردم.»

# .: بەشی ٦ :.

دەڵێن سێ شت خەم و پەژارە لەسەر دڵی ئینسان لادەبەن. یەک، تەماشای گوڵ و گوڵزار و سەوزایی و باغ و باغات، دوو، تەماشای چۆم و رووبار و تاڤگە و کانی و سەرچاوان، سێ، تەماشا و دیداری ئینسانی باش و رووخۆش وەک شاعیری عەرەب دەڵێ :

ثَلَاثَةٌ يُذْهِبُ عَنْ قَلْبِ الحَزَنْ    اَلْمَاءُ وَ الْخَضْرَاءُ وَ الْوَجْهُ الْحَسَنْ

کەوابوو برای بەڕێزم! کە دڵتەنگی و خەم و پەژارەت بۆ پەیدا بوو، برۆ بۆ ناو باغ و باغات و چیمەن و گوڵ و گوڵزار و کوێستان و هۆبە و هەوار و سەرچاوەکان و رووباران؛ فکر لەم بونەوەرە و لە سانیعی ئەم بوونەوەرە بکە و خەم و پەژارەی خۆت وەبەر بای دە و ژەنگە سوورەی فکر و خەیالان لە خۆت بڕەوێنە و لەگەڵ سروشت هاودەم بە و مەلی خۆش خوێن بدوێنە و بڵێ :

بوولبوولی چاو مەست دەسا بادەوە
بە خۆ و بە گوڵ و جامی بادەوە
وا تێمەگە لە بادە ئاوی ترێم مرادە
مەستی شەرابی وەحدەت پوولێ بەمانە نادە

هەروەها برۆ بۆ لای ئینسانی باش و رووخۆش و قسەخۆش هەتا دڵت بکرێتەوە و هەروەها جارجاریش برۆ بۆ سەفەر و سەردانی دۆستان، چونکە دیداری دۆستان شەفای دڵانە، بە قەولی عەرەب : لِقَاءُ الْمَحْبُوبِ، شِفَاءُ الْقُلُوب.

شاعیرێک دەڵێ دونیا هەوارگەیەکی کەمە؛ ئینسان ناگات جێی قونی خۆی گەرم کات دەڵێن هەستە برۆ.

غم از گردش روزگاران مدار    که بیجا بگردد بسی روزگار

زانایەک دەڵێ ئینسان نابێ شەخس‌گەرا و حیزب‌گەرا و مەسلەک‌گەرا بێ، بەڵکوو دەبێ حەق‌گەرا و واقیع‌گەرا بێ. دیارە لەناو هەموو مەزهەب و مەسلەک و گرۆ و دەستەجاتا حەق هەیە و باتڵ هەیە. ئینسانی چاک هەیە و ئینسانی خەراپ هەیە، جا کە واقیع‌گەرا بووی تەعەسسوب و لایەنگەری بە خەرج نادەی بەڵکو دەرکی حەق دەکەی و ئینسانە چاکەکانی هەموو لایەکت قبووڵە و ئینسانە خەراپەکانی هیچ لایەکیشت قبووڵ نییە. بۆ روون بوونەوەی مەبەست چەند باغێک هەن، هەمووی ئەو باغانە گوڵیشیان هەیەو چەقڵیشیان هەیە، ئەتۆ دەبێ گوڵی هەموو باغەکان بە گوڵ چاو لێبکەی، ئیستیفادە لە بۆن و بەرامی بکەی، هەروەها چەقڵەکانیش بە چەقڵ چاو لێبکەی و خۆیان لێ بپارێزی، بێگومان ئینسان ئەگەر بە گرۆ و دەستەجات خۆی بەستەوە، لایەنگری دەیگرێ و هەر خۆی و دار و دەستەکەی خۆی قبووڵە، بۆ نموونە ئەگەر پێی بڵێن فلانکەسێک لە ناو فلان گرۆ و مەزهەبدا ئاوا زانایە و ئاقڵە و ئەهلی چاک و چاکە کارییە، قبووڵی نییە بەڵام بە پێچەوانە ئیخۆی بە هەموو نەزانی و خەراپییەکەوە قبوولە. هیوادارم کە حەق‌گەرا و واقیع‌گەرا بین.

جارێک کابرایەکی مەشرەب کۆمۆنیست بە رەخنەوە گوتی : تۆ فرە ژنیت قبوولە؟ گوتم : بەڵێ، گوتی : دەلیلت چییە؟ ئەگەر بە قورئان جوابم بدەیتەوە قبوولم نییە، گوتم : باشە، ئەتۆ باوەڕت بە دیموکراسی هەیە؟ گوتی : بەڵێ گوتم : باشە، مەگەر لە قانوونی دیموکراسیدا بەشەر ئازاد نییە؟ گوتی : بەڵێ گوتم : کەوابێ ئەتۆ حەقی رەخنەت نییە، بۆ؟ چونکە ئەو کەسەی کە دوو ژن و سێ ژنی هەیە ئارەزووی لەیلا خانە و دەیهەوێ بیهێنێ، هەروەها لەیلا خانیش ئارەزووی لە رێبوارە و دەڵێ : ئەمن رازیم ئەگەر رێبوار سێ ژنیشی ببێ مێردی پێدەکەم. ئایا ئەتۆ بە پێی قانوونی دیموکراسی حەقت هەیە بەرگریان بکەی دوای ئەوەی ئەوان رازین ئەتۆ چکارەی؟ جا مادام ئەتۆ باوەڕت بە دیموکراسی بێت حەقی رەخنەت نییە.

## .: بەشی ٧ :.

فەقێیەک بۆی گێڕامەوە گوتی لە سلێمانی، لە لای مامۆستایەک دەمخوێند، ئەو مامۆستایە بە «فسە»ی قەڵس دەبوو، رۆژێک دەرسی پێدەگوتم، لەو کاتەدا پشیلەیەک هاتە ژوورەوە و چۆ گیان چێشتەکە، منیش گوتم خوایە ئەگەر دەڵێم «فسە» مامۆستا قەڵس دەبێ، ئەگەر واناڵێم

چێشتەکە دەخوا، گوتم وا باشە بە نێوێکی کە دەنگی بدەم کە بڕوا و مامۆستاش قەڵس نەبێ، یەک بە خۆم گوتم «وەحە»، مامۆستا ڕاچڵەکی و گوتی هەی مردووت نەمرێ، سەد جارت بگوتایە «فسە» و جارێک نەتگوتبایە «وەحە»، خۆ تۆقیم. لەم نەقڵەدا ئەوەمان دێتە دەستێ کە ئینسان نابێ بە هیچ شتێک قەڵس بێ، بەڵکوو دەبێ بەحر بێ و شلوێ نەبێ و بە هەموو بایەک نەلاریتەوە و نەبەزێ و نەتەزێ.

خاڵ مەولوودێک هەبوو کە پێیان دەگوت «مەوزووعی قۆتانێ چی لێهاتەوە» قەڵس دەبوو و دەیگوت مەوزووعی قۆتانێ ئەوەیە دایکتم وا لێکردووە، دیارە ئەگەر قەڵس نەبوویایە کاریان پێنەدەبوو، کەوابوو چارە ئەوەیە ئینسان بە قسەی ئەم و ئەو و تانە و تەشەر قەڵس نەبێ و لۆکە لە گوێیان هاخنێ و هەروەها خەڵکیش نابێ ئەوچەشنە کەسانە ئەزییەت و ئازار بدەن، چونکە مەردومئازاری تاوانێکی زۆر گەورەیە، بە واتایەکی دیکە نیشانەی نەزانی و بێ فەرهەنگییە.

عەلائەددینی سەجادی دەڵێ: کاتێک کە دەستم کرد بە نووسینەوەی ڕشتەی مرواری؛ بازێک لە برادەران ڕەخنەیان لێگرتم. گوتیان بۆتۆ عەیبە؛ ئەم نەقڵە قۆڕانە دەنووسیەوە کە چی؟ هەر ئەوانە کاتێک کە جلدی ئەووەڵ لە چاپ درا، گوتیان ئەرێ جلدی دووەم کەنگێ لەچاپ دەدەی؟ بە کورتی ئەم ڕەخنەگرانە بوون بە هاندەرم.

## .: بەشی ٨ :.

فەقییەک بۆی گێڕامەوە چوومە خانەقایەک، سۆفیان زکریان دەکرد کە چاویان پێکەوتم گوتیان فەقێ دەی ئەتۆش سەڵەواتمان بۆ لێدە، منیش دەستم لە بنا گوێنا و گوتم :

جـەهەندەمـەی هـانـە هـانـە        تێیدان سـۆفی دە ریش پانە پانە
سـەلا لەوەی لەگەڵ وانە
جـەهەنـدەمـەی گـێژە گـێژە        تێیدان سـۆفی دە ریـش درێـژە
سەلا لەوەی گێژە و هێژە

سۆفیەکان کە ئەوەیان گوێ لێبوو لەبەر پێکەنین زکر و زکریان لەبیر چۆوە، مورید بە و مەرید مەبە، سەید بە و سیدمە مەبە. دیارە فەقێی فەقیر ناحەقی نەبوو کە ئەو سەڵەواتانەی بۆ لێدان، ئەو بێخەبەر بووە لە بەرنامەی سۆفیگەری هەر «ضرب زیدٌ عمرواً»ی دەزانی.

هەر لەو رابیتەدا دەڵێن سۆفیەک هەبوو دەیگوت ئەمن لە نژادی کاک ئەحمەدی شێخم، ئەگەر رقم هەستێ قوونێ بە عەرزێ دادەدەم دونیا خەراب دەبێ. بێگومان ئەوە داوایەکی دوور لە عەقڵە و نەزانییە، هەروەها مرۆڤ نابێ بە نەسەب و قەوم و تایەفەی بنازێ، بەڵکوو دەبێ بە عەمەل و کردەوەی باش بە عیلم و هونەر پشت ئەستوور بێ، ئەوەیە کە شاعیر دەڵێ :

چـو نـادانـان نــه در بـنـد پـدر بـاش      پــدر بـگذار و فــرزنــد هـنـر بـاش

# .: بەشی ٩ :.

دەڵێن کابرایەک دەیهەویست سیغار و سەبیلە تەرک بکا، چەند جارێک سەبیلەی تەرک کرد و بۆی تەرک نەدەکرا. رۆژێکیان بە رەفیقێکی گوت هەر چەند دەکەم سەبیلەم بۆ تەرک ناکرێ، رەفیقەکەی گوتی ئەمن فێڵێکت پێدەڵێم ئەگەر وابکەی تەرکی دەکەی. گوتی خوا دەکا تەرکی دەکەم هەرچی بێ بە قسەت دەکەم. گوتی کاکە هەروەخت سەبیلەکەت تێکرد قونچکی سەبیلەکەت لە کونێ خوارێ نێ، ئەو وەختە پیس دەبێ و بێزت لێهەڵدەستێ و نایکێشی و تەرکی دەکەی. گوتی زۆر باشە، ئەوەش بە تاقی دەکەینەوە. بەڵێ ماوەی دوو مانگ ئەو کارەی کرد. رۆژێکیان لێی پرسی ئەرێ سەبیلەکەت تەرک کرد؟ گوتی بەڵێ ئەمما ئێستا فیعلێکی دیم لێ پەیدا بووە، لەسەرەوە تەرکم کردووە بەڵام کونی خوارێم فێر بووە، دەبێ هەموو رۆژێ سەری سەبیلەکەی تێ رۆکەم، گوتی دەک بەخێر نەیەوە بۆ فیعلی فێری بووی، هەر سەبیلەکەت بکێشایە باشتر بوو. بەڵێ سیغار کێشان سەرەڕای ئەوەش کە زەرەری گیانی و ماڵی تێدایە ئەو فێڵانەشی تێدایە.

«رەحمانی ئەمینیان» دەیگوت لە میسر چوومە لای موفتی جامیعولئەزهەر، کاغەزێکم خوێندەوە کە عولەمای جامیعولئەزهەر فتوایان دابوو کە سیغار حەرامێکی رووتە، دەڵێ ئەمنیش زۆرم پێ خۆشبوو. بە موفتیم گوت بریا سەد ساڵ بووایە ئەم فتوایە دەرکرابایە.

بە بۆچوونی من هەموو شتێک، پێشەکییەکی هەیە؛ تریاک کێشان و موعتاد بوونیش پێشەکییەکەی سیغار کێشانە. با ئەوەش بڵێین قەدیم کە گەنجان سیغاریان دەکێشا وەڵاتەکەمان لە تریاک و موعتادی بەدوور و خاوێن بوو، لەبەر ئەوەی تەنیا هەر سیغارکێش بوون و بە پاکی دەمانەوە، بەڵام ئەمڕۆ بەداخەوە زۆرێک لە جەوانەکانمان موعتاد بوون و بوونە تریاکی کە ئەمە

خەسارێکی گەورەیە کە لە کۆمەڵگاکەمان کەوتووە، چونکە ئەو گەنجانە ئومێدی داهاتووی ئێمەن و ئاڵاهەڵگری گەلەکەمانن؛ کە وابوو نەفرین و بێزاری لەو کەسانەی کە جوانەکانمان بە بەرەو فەساد و بێ بەند و باری و موعتادبوون دەبەن و کەراسی شەرافەت و کەرامەت و ئینسانیەتیان لەبەر دادەنێن و لە کەڵکی دونیا و پەسلانیان دەکەن. جا داوا دەکەم لەو گەنجانەی کە بە خاوێنی و پاکی ماونەوە نەهێڵن چیدی گەنجەکان بەرەو موعتادی و بێ ئەخلاقی و داوێن پیسی بڕۆن.

دەڵێن جارێک گارانی گوندێک مۆزیان پێوەر بوو، بەشی زۆریان مۆزیان کرد و هەڵاتن، شوانەکە گوتی کوڕینە ئەوانەی مۆزیان کرد و هەڵاتن تازە لەوان گەڕێن، ئەوانەی کە ماون نەهێڵن مۆزکەن و هەڵێن، ئێوەش گەنجەکان بە قوربانتان بم وریا بن. ئەو جەوانانەی کە بە خاوێنی ماون موعتاد و خەسار نەبن.

دەڵێن جەماوەر بە قودرەت و سەروەت و سامان پێشکەوتنی نابێ، بەڵکو بە عیلم و زانیاری و ئەهلی شێعر و ئەدەب تەرەقی و پێشکەوتنی دەبێ، دیارە مێژوو شایەتی دەدا لە سەر ئەم بابەتە.

دەڵێن سێ شت مانیعی پێشکەوتنی جامیعەن : نەزانی، زۆرەملێ و لایەنگری

دەڵێن نێوبانگی چاک باشترە لە تەمەنی درێژ. دیارە تەمەن هەرچی درێژتر بێ تەواو دەبێ بەڵام ئاسار و شوێنەوار و ناوبانگی چاک بۆ هەمیشە هەر دەمێنن. بەڵێ کەم بژی و کەڵ بژی، تەمەنت کورت بێ و نێوت درێژ بێ.

## .: بەشی ١٠ :.

کابرایەک بۆی گێڕامەوە گوتی : مەلایەکمان هەبوو مووەسویس بوو، رۆژێک جەماعەتی بۆ دەکردین. هەر دەیگوت نیەتمە دەکەم ... ، نیەتمە دەکەم ... ، نە جارێک و نە دە جار، ئێمەش زۆر بە پەلە بووین، دەچوین بۆ دروێنێ، گوتم : مەلا نیەتمە دەکەمت بۆ نایە، پێچەوانەکەی بڵێ.

بێگومان وەسوەسەش نەخۆشییەکی نەفسییە. ئینسان وا باشە خۆی لەو نەخۆشییە بپارێزێ، چونکە نەخۆشی نەفس هۆی عەزابی گیانی خۆیەتی؛ تەنانەت ئەسبابی زەحمەت و ئازارە بۆ ماڵ و منداڵیش.

# .: بەشی ١١ :.

جارێکیان زستان بوو، کەوشەکانم تەڕ ببون، ئەمنیش بردمنە ژوریَ و لەبەر کوورەم دانان وشک وەبن. هادی کوڕیشم کەوشەکانی خۆی هێنان لە کن ئیمنی دانان، فەریدەی کچم کە منداڵ بوو بە هادی گوت :

هەتیوە ئەوە ئەتۆش غەڵەتی باوکم دەکەی.

هەروەها هادی کە کەلاس دوو بوو داستانیان ویَ دەدان، ئەمنیش بۆم مەعنی دەکردنەوە و دەمگوت دەڵیَ : شلووقیان مەکە، عاقڵ بە و دەور و دەرسان حازر کە و تەنبەڵ مەبە، ئەویش ورد گوێی دەگرت، تا بوو بە کەلاس سێ، ئەو کاتە بۆ خۆی کەمتاکورتێک لە داستانەکان حاڵی دەبوو، گوتی بابە ئەوەی کە تۆ بۆم مەعنی دەکەیەوە هیچی وا نییە و لە داستانەکەدا نییە.

دەڵێن پیر و مریدێک میوانیماڵێک دەبن. زۆر هرژار دەبن، تەنیا بزنێکیان دەبێ، بە شیری ئەو بزنە دەژین. مریدەکە بە پیرەکەی دەڵیَ : ئەو ماڵە چەند فەقیرن، هەر ئەو بزنەیان هەیە. پیر دەڵیَ : جا ئەگەر بەزەییت پێدا دێن برۆ بزنەکەیان لیَ سەر برە. مرید دەچیَ بە دزیەوە بزنەکە سەر دەبڕیَ. بەیانی زوو دەڕۆن. دەروێش لە شێخەکەی دەپرسیَ : ئەوە چ سرڕێک بوو؟ گوتی : ئەو ماڵە چاویان هەر لەو بزنەوە بڕیوە هیچ کارێکی دیکە ناکەن، بۆیە ئاوا فەقیرن. سوتفە دوای سێ ساڵان دەروێش بەوێدا دەڕواتەوە، تەماشا دەکا ئەو ماڵە کە زۆر فەقیر بوون زۆر دەوڵەمەند بوون و چاویان بوونەوە. دیارە بەشەر دەبێ تەمبەڵ و تەوەززەل دانەنیشێ و چاو لە شتێکەوە نەبڕیَ، بەڵکوو دەبێ بۆ ژین و ژیوار زۆر هەوڵ بدات.

هەروەها منداڵ بووین؛ لەگروێس بۆ گیلاخە ئەو شێعرەمان ساز کردبوو، بە دەنگی بەرز دەمانگوت :

گیلاخە سەلکت دەبەم بۆ ئاغا، ئاغا لوشمە لوشمیەتی، داوای چێشتی ترشیەتی

یان دەمانگوت :

هەنگەڵان و مەنگەڵان ، هەرچی نەیەتە هەنگەڵان ، دایەی داوێنە بەر کەڵان.

ئەوە نەوعێک گاڵتە و سەرگەرمی دەورانی منداڵی ئێمە بوو، دیارە دونیای منداڵیش دونیایەکی خۆشە و تایبەتییە، هەرچی بیکا و بیڵیَ رەخنەی لەسەر نییە.

بـــە بیـــرەوەری دەوری منـــداڵیم      سەردەمی خۆشی و زۆر بێخەیاڵیم

# .: بەشی ١٢ :.

دەڵێن کوڕێکی نابوودۆکە دەبێ دەیهەوێ ژن بێنێ، کچ لەبەر ئەوەی کە روو بازاڕی نابێ شووی پێ ناکەن. هەرچۆنێک بێ، براکانی کچێکی بۆ ساز دەکەن و بۆی دێنن. کابرا چەند مانگێک لێی نابێ بە زاوا، براکەی لێی توورە دەبێ و دەڵێ : مردووت نەمرێ، تا ژنمان بۆ هێنای مێشکی سەرت بردین؛ ئێستاش دەڵێی کێوی هۆملم بۆ کون دەکەی. ئەویش لە جوابدا دەڵێ : جا ئەگەر پیاوی ئەتۆ کونێکە ... . شێعری چای خواردنەوە و ژیانی بە شەرافەتەوە.

گەر دەزانی لەززەتی چـا و چـا بـژین چا دەنۆشی و چا دەژی گیـانی ئـەمین
(دونیا وەکوو تاوە و بە تاوێ تێدەپەڕێ دەخیلە نەکەی بە تاوێ خۆ بفرۆشـی)

***

(تاڵ و شیرین پێکەوە نەمدیوە چا بێ چانە بێ
هــەر کەسێکی چانــە بــێ پێــت چانــە بــێ)

***

(چــای بــە خــدا زمزمــەی مجلــس مــایی
بــر انجمــن پیــر و جــوان شــمع ضــیایی)

# .: بەشی ١٣ :.

دەڵێن کابرایەک تووشی منداڵێک دەبێ کە دووسەد تمەنی پێیە، دەڵێ کاڵەکێکت دەدەمێ ئەو پارەم بدەیە، منداڵەکە دەڵێ بزەرێنە بە خۆڕایی دەتدەمێ. کابرا بەولا و ئەولای خۆیدا دەڕوانێ و کەس دیارنابێ دەزەڕێنێ، منداڵەکە دەڵێ خاڵە وا دیارە زۆر کەری، وەڵڵا ئەگەر هەزار جار بزەڕێنی قڕانێکت نادەمێ. ئەی خاڵە ئەتۆ بە تەمەن ٧٠ ساڵی بەڵام بە ئاقڵ حەوت ساڵی.

شێخی سەعدی دەڵێ : پیرێژنێک لە سەحرایەک با سەت ژانەسەر ئاگرێکی کردەوە کە خۆی لەبەر گەرم وەکات. بایەکی توند هات ئاگرەکەی لە پیرێژن کوژاندەوە. پیرێژن قەڵس بوو، دەستی کرد بە هات و هاوار. هەزار جنێوی بە بایەکە دا کە بۆ ئاورەکەت لێکوژاندمەوە. دەڵێ پێیان گوت :

فرشته‌ای که وکیل است بر خزائن بـاد چه غم خورد که بمیرد چـراغ پیرزنـی

دەڵێن شێخێک بەرماڵێکی بۆ ماڵی ئارەقخۆرێکی برد، گوتی با ماڵەکەت بەرماڵیشی لێبێ، چونکە میوانی وات دەبێ کە نوێژ بکات، گوتی زۆر باشە، دوای ماوەیەک کابرای ئارەق خۆریش شووشێک ئارەق بۆ ماڵی شێخ دەبات؛ دەڵێ قوربان ئەمنیش شووشێک ئارەقم بۆ هێناوی چونکە تۆش میوانی وات دەبێ کە ئارەقخۆر بێت.

دەڵێن کوڕێک لە سەربازی بە سواری کەرێوە وێنەی خۆی دەگرێ و بۆ دایکی دەنێرێتەوە و لە پشتی وێنەکە دەنووسێ دایە گیان لێت تێک نەچێ ئەوەی سەرەوە ئەمنم.

جارێکیان کۆڵێکم خەیار وترۆزی بۆ ماڵی خەزوورم بردن کە ماڵیان لە هەواری بوو، ئەو کاتە خێزانم دەزگیرانم بوو. خۆشی خۆشی جا دەزگیرانم زۆر بەخێرم دێنی و شیرێژ و رۆنم دەداتێ، کەچی بە پێچەوانە نێوچاوانێکی گرژ و تاڵ نان و دۆیەکی ترش و گەرمی بۆ دانام بەڵام لە دواییدا تۆڵەی بۆ کردمەوە و گەردنم ئازاد کرد. ئەوەیە کە دەڵێن : ئەوەی لەسەر سەبرانە، لەسەر خێرانە.

دەڵێن پیاوچاکێک دەپاڕایەوە دەیگوت خوایە ئەگەر دەمبەیە جەهەندەم، ئەوەندەم گەورە کە جەهەندەم پڕ کەمەوە، هەتا جێگای کەسیتر نەبێتەوە و لە جیاتی هەموو عالەم عەزابم بدە، ئەمە ئەوپەڕی بەشەردۆستی و سۆز و بەزەییە، بەڵێ مرۆڤ دەبێ گەلدۆست بێ و گەلدزێو نەبێ، گوڵ بێ و چەقڵ نەبێ، ئەوەیە مانای مرۆڤایەتی.

بدی را بدی سهل باشـد جـزا اگر مرد أحْسِـنْ إلـی مـن اسـا

سعدی

ساڵی ٢٠١٠ی زایینی، پێنج رۆژی پاییز مابوون کە بارانە باری و بە قەولی کوردەواری پەڵەیدا. سوتفە پاییزی ئەو ساڵە لە سلێمانی بووم، خەڵک دەچوون بۆ نوێژە بارانە. کوڕێک بە مەلای گوت : مامۆستا؛ چەترم لەبیر چووە. مەلاش گوتی : قەیدێ ناکا، إن شاالله ناباری.

# .: بەشی ١٤ :.

پێویستە مرۆڤ لە قسەکردندا بەرابەرەکەی لەبەر چاو بگرێ و وشەی نەناسراو بۆ کەسێک کە بە زمانی پەتی و سادە حاڵی دەبێ بەکار نەهێنێ.

ڕەحمانی برام دەیگوت لە تەورێز لە مەلایەکی وڵاتم پرسی خەڵکی کوێی؟ گوتی خەڵکی قەریەکی موحەققەرم. گوتم مەلا بۆ نالێی خەڵکی گوندێکی بچووکم، ئەو موحەققەرەت لە چییە؟

دەڵێن کابرایەک زۆر دەوڵەمەند بوو، بە نەفەرێک دەڵێ ئەگەر سەرووەتەکەم بۆ حیساب کەی، خانوێکت بە جایزە دەدەمێ. کابراش دەچێ لە بازار دوازدە متری خام بۆ دەکڕێ و بۆ کابرای دەوڵەمەندی دەبا و دەڵێ سەرووەتەکەت ئەو دوازدە مەترە خامەیە، کابرا زۆری پێخۆش دەبێ و دەڵێ لە بەرامبەر ئەو خەڵاتە ئەوا خانویەکم بە خەڵات دا بە تۆ.

دیارە زۆر کەس کە دەوڵەمەندن لەبەر ڕژدی و کوێرنانی سەرووەتەکەیان نە بۆ خۆیانە و نە بۆ خەڵک. تەنیا کفن نەبێ هیچیان پێ نابڕێ، بە قەولی مەعرووف : «ماڵی هیچ نەخۆری بۆ چەکمە بۆری» جا ئەی برای دەوڵەمەند تا هەل و مەرجت لەدەست نەداوە بە خۆشی ڕایبوێرە و ژین و ژیوارت ڕێک و پێک و تێر و تەسەل بێ و خزمەت بە گەل و وڵات بکە و لە فکری فەقیر و هەژاردا بە؛ بەکورتی دەوڵەمەندێکی بە خێر و بێر بە بۆ خۆت و گەل و نیشتمان.

ئەی برای خەمۆکی! ئەگەر خەم و خەفەتێکت بوو بڕۆ بۆ گەشت و گوزار لە کوێستان و هۆبە و هەوار و سەرچاوەکانی و ڕووباران، خەم و پەژارەی خۆت وەبەر با دە و لەگەڵ بووکی سروشت دەستلەملان بەو گوێ لە شنەی شەماڵ و خشەی داران و خوڕەی ئاوان و نەغمەی مەلان ڕابگرە کە بە ڕاستی باشترین خەمڕەوێن و بلاوێنن، چاو لەئەمین کە و وەک ئەمین بڕۆ لە چوارپارچەی کوردستان گەشت و گوزار بکە. هێندە لە گۆشەی ماڵ و دوکان مەخزێ و خانە نشین مەبە، بە قەولی سەعدی :

تـا بـه دكـان و خانـه درگـروی      هرگـز ای خـام، آدمـی نشـوی

ئەگەر هەر نەبێ تەماشای پەڕتووکی بەهەشتی کوردستان و گەشتی کوردستان بکە و بە خەیاڵ بڕۆ بۆ بیستون و تاقی بوستان و ڕێژاو و ڕەوانسەر و هەروەها بڕۆ بۆ بەشی هەورامان کە بەهەشتی سەرزەمینە، لە وێش بچۆ بۆ سەیری کونی خاڵە حوسێن و چیای شاهۆ و غاری

قوری قەلعە و خانەگا و سولتان ئیسحاق و کۆسەی هەجیج و سەرچاوەی بڵ کە بەهارە و هاژە دەردەپەڕێ و دەڕژێتە ناوچۆمی سیروان؛ بڕۆ بۆ هەورامانی تەخت و کوێستانی دالانی و تەتە کە بەسەر شارەزوور دادەڕوانن، بڕۆ بۆ سەرچاوەی زەڵم و زێباری مەریوان و ئابیدەر و کانی شفا لە سنە و غاری کەرەفتوو، تەختی سولەیمان و چیای چلچەمە و سەرچاوەی ئاودەرەمەلان و کەلیخان و چیای وەنەوشە و فەرهاد و تەرەغە و تاقەدار و چیای کەوسەر و رندۆلە و بابۆلە و شێخ رەش و عەینەرۆم و دالانپەڕ و قەندیل و هەلگورد و حەسەنبەگ و شەقلاوە و سەرچاوەی بێخاڵ و گەلی عەلیبەگ و جوندیان و کانیماران و هێران و نازەنین و سەرچاوەی رانییە و چنارۆک و قەلای هەولێر و سەددی دوکان و پیرەمەگرون و کانیوەتمان و کانیشەیتان و سەرچنار و گمۆ و ئاسۆس و دۆلان و سەرچیمەن و هۆمل و ئاوەهەلدێری شلماش و باژاڕ و هۆینەماڵ و بێورە و بێوران و دەشتی وەزنێ وسەری گۆمێ و مەیدان چۆغە و تۆرە و کانی گراوان.

خوێنەری بەڕێز! هەمووی ئەوانە لە بەهەشتی کوردستان و گەشتی کوردستاندا بە وردی باسم کردوون لە کوێن و سەر بە کوێن.

# .: بەشی ١٥ :.

ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی هادی کوڕم تەلەفۆنی کرد گوتی : بابە ئەمن ئێستا لە شیراز لە لای دوو نەفەرانم هەردووکیان گلێیان لێ هەی، یەکیان دەڵێ ئەمن دوو کتێبم داونێ زۆریشی ئیستیفادە لەو کتێبانە کردووە بەڵام بێوەفایە تا ئێستا جارێک سەردانی نەکردووم. ئەوەی دیشیان دەڵێ ئەمنیش کتێبێکم داوەتێ قەتی موتالا نەکردووە. منیش پێم سەیر بوو، گوتم هادی ئەمن ئاشنام لە شیراز نین. ئەوانە کێن؟ ئەویش پێکەنی و گوتی یەکیان شێخی سەعدییە و کتێبەکانیش بریتین لە گوڵستان و بوستان، ئەوەی دیشیان حافزە. گوتم وەڵلا هەر دووکیان راست دەکەن، بە جێیە. دوایی گوتی باوکە با ئەم شێعرەش کە لەسەر گۆڕی سەعدی نووسراوەتەوە بۆت وەخوێنم.

عجب گـر بمیـرد چنین بلبلـی  که بـر اسـتخوانش نروید گلـی

بەهەر حاڵ قەتم ئەو بیرەوەریە لەبیر ناچێتەوە.

بە ڕاستی گوڵستان و بوستانی سەعدی قەت لە باو ناکەون، بۆ نموونە کە دەڵێ :

بنی آدم اعـضای یـکـدیگرنـد     کـه در آفـرینش ز یـک گوهرنـد
چـو عضوی بـدرد آورد روزگـار     دگـر عـضوها را نمانـد قـرار

بەڵام یەکێک لە داخی خەراپی و ناڕاستی خەڵکی ئەم زەمانە ئەم شێعرەی پێچەوانە کردۆتەوە و دەڵێ :

بنـی آدم اعـدای یکـدیگرنـد     کـه در آفـرینش بـد از بدترنـد
چـو عضوی بـدرد آورد روزگـار     دگـر عضوهـا را جـهنم، چـه کـار

بە ڕاستی ناهەقی نەبووە، ئەمڕۆ کە ئەوەندە زوڵم و ستەم و فرت و فێڵ و بێ ئەخلاقی پەیدا بووە خۆشی و ئەمنیەت بۆ کەس نەماوە، مەگەر خوا ڕوحم کا و ئاڵوگۆڕێکی باش بە سەر جەماوەردا بێنێت و جامیعەیەکی سالم و ڕێک و پێک بە وجوود بێنێت.

# .: بەشی ١٦ :.

دەڵێن کابرایەک تووشی لە هەورازێک دەکەوێ زۆر ماندوو دەبێ، دەڵێ خوایە وەڵاغێکی سواریم بۆ بنێری هەتا لەو هەورازە سواری بم کە ئاوڕ دەداتەوە ئەوە کابرایەک ماینێکی پێیە. گوتی ئەوە خوا ناردی کە نزیک بوو دیتی جوانوێکی لە بەرە و وەستاوە، کابرای خاوەن مایین جوانوەکەی بە زۆر پێ لە کۆڵنا. بۆ خۆی بە بەتاڵی نەیدەتوانی بڕوا جوانوشیان پێهەڵگرت. چا لەبەر خۆیەوە دەیگوت خوایە ئەمن گوتم وەڵاغی سواریم بۆ بنێرە و سواری بم نە بمکەی بە وەڵاغی سواری و سوارم بن و جوانووم پێهەڵگرن. دیارە ئەو کابرایە تەنبەڵ بووە بۆیە تووشی ڕەئەم بەزمە کەوتووە ئەینا لە لاقی خۆی وەراندایە و بڕۆیشتبایە.

دەڵێن عەرەبێک لەسەرە مەرگدا بە وشترەکەی دەگوت : ئەمن دەمرم، دەبێ گەردنم ئازا بکەی چونکە زۆرم تینو و برسی کردووی و باری گرانم لێناوی. وشترەکە گوتی : لە هەمووی ئەوانە گەردنت ئازا بێت بەڵام لەیەک شت نەبێ، ئەویش ئەوەیە جارێکیان حەوسارەکەی منت لە پاڵووی کەرێک خست، ئەمن ناچار بووم دەبوو وە دوای ئەو کەرە کەوتمایە.

لەو نەقڵەدا دەرسێکی زۆر گرنگ هەیە، ئەوە کە ئینسان نابێ لە کار و باری ژیاندا وە دوای ئینسانی نەزان و بێعاقڵ کەوێ، بەڵکوو دەبێ پەیڕەوی لە کەسێک بکات لە خۆی زاناتر بێت. کە

وابێ کۆمەڵگای بەشەر دەبێ کەسێکی زانا و لێهاتوو بکاتە گەورە و رابەری خۆیان بۆ ئەوەی هەتا کاروباری دین و دونیایان بە باش بۆ بچەرخێت و سەرگەردان و دواکەوتوو نەبێ. جا بەدبەختی و رۆژڕەشی بۆ گەلێک کە پێشەوا و رابەریان بێئاقڵ و نەزان بێ، بە قەولی کوردی «واوەیلا بۆ کەسێک کە پێشەنگی کەر بێت.»

دەڵێن کابرایەک لە مەلای پرسی دروستە پیاو لە مزگەوتدا دەست بە ئاوێ بکات، مەلا گوتی نا درووست نییە. کابرا گوتی ئەی ئەگەر هەموو دونیا مزگەوت بێ لە کوێ دانیشم؟ مەلا گوتی لەسەر فلانم دانیشە.

لەم نەقڵەدا ئەم دەرسە وەردەگرین کە ئینسان نابێ پرسیاری بێجێ بکات و خۆی تووشی وڵامی بێجێ بکات. هەروەها مرۆڤ لە کاروباری ژیاندا دونیا لە خۆی وەتەنگ هەڵێنێ و نائومێد بێ و بڵێ هیچ کەلێنێک نەماوە و شەشدەرم لێ گیراوە و لەسەر ئەم گردە زەویە بستێک نەماوە لێی دانیشم.

دەڵێن کابرایەکیان بەردە باران دەکرد، لەو کاتەدا رەفیقێکی دەبێ تووشی رەوی دەکەوێ، ئەویش گوڵێکی پێدا دەدات و دەڕوا. کاتێک کە کابرا لە بەردە بارانەکە خەلاس دەبێ رەفیقەکەی دەچێتە لای بۆ دڵنەوازی. کابرا دەڵێ : فلانی ئەمن بە بەردە بارانی خەڵک ناڕاحەت نەبووم چونکە ئەوان دوژمنی من بوون بەڵام بە گوڵەکەی تۆ ناڕەحەت بووم کە پێت دادام چونکە تۆ دۆستم بووی، نەدەبوایە گوڵیشم پێدادەی.

دیارە دوژمن هەرچی بکات گلەیی لێ ناکرێت و نێوی خۆی بە خۆیەوە، بەڵام دۆست ئەگەر گوڵانت پێدادات لە دڵت گراندێ، کەوابوو دۆست دەبێ وەک گوڵ بێ و گوڵت پێدانەدات و دوژمنت پێخۆش نەکات و چەقڵ نەبێ.

## .: بەشی ١٧ :.

ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی گەشتێکم بۆ هەورامان کرد، دیارە خاترە و بیرەوەری ئەم سەفەرەم لەگەڵ سەفەرەکانی پێشتر، لە کتێبی گەشتی کوردستان هێناوە بەڵام یەکێک لە بیرەوەریەکانم ئەوەیە : لە پاوە چوومە لای ماڵی مامە حوسێنی کۆکەن، ئەو کابرایە لە شاخ بە پاچ و قولێنگ سرویسە خانووی دروست کردووە. بە راستی کاری وی زۆر لە کاری فەرهاد

گرنگترە. گوتم ئەی مامە حوسێن مەردی لە گۆڕێ، بەم کار و بارە خۆت لێنەگۆڕێ، هەر وەکوو جاران وەرەوە گۆڕێ.

دەڵێن مێرووڵێک لە گژ کێوێکی بەرز ڕاچووبوو کە وەیگوێزێ، پێیانگوت مێرووڵە ئەتۆ بۆ لە گژ ئەو کێوە ڕاچووی، خۆ کاری تۆ نییە. گوتی دەزانم کە کاری من نییە ئەمما مەعشووقەکەم دەستووری پێداوم ناتوانم لە قسەی دەرچم. هەتا دەردی عیشق نەچێژی بە هیچی دەگری و لێی گێژ و هێژی.

عاشقی داماو خەوی حەرامە      خەوی بۆ چییە یاری مەرامە

دەڵێن مەلایەک دەفتەری ئیزدیواجی هەبوو. شەوێک لە مەجلیسی میوانداریدا جەماعەت ڕوو لە مەلا دەکەن و پێی دەڵێن : مەلا بۆ ئیمەت بە ژنانەوە گرفتار کردووە؟ مەلاش دەڵێ هەرچی نارازییە بیداتەوە بە خۆم. جەماعەت بێدەنگ دەبن و دەڵێن مەلا نە تۆ دەنگ و نە مە دەنگ.

ڕۆژێکیان کابرایەکی سیغارکێش هاتە دوکانێ، گوتی : فلانکەس قسێکت پێدەڵێم لە ڕوودڵسۆزیەوە نابێ پێت ناخۆش بێت. گوتم فەرموو، گوتی ئەتۆ بۆ هێندە بە شێعر نووسینەوە خۆت ماندوو دەکەی؟ ئەگەر بە قسەی من دەکەی تەرکی دەکەی. گوتم باشە بەڵام بەو مەرجە ئەتۆش سیغار تەرک کەی. گوتی ئاخر من پێی موعتاد بووم و تەرکی عادەت نەخۆشییە. گوتم مەردی حیسابی ئەتۆ داوای تەرکی شتێکی حەڵاڵ و ڕەوا لەمن دەکەی، بەڵام بۆ خۆت حازر نی شتێکی حەرام و ناڕەوا تەرک بکەی. هەروەها ڕۆژێک کابرایەکی سیغارکێش پێی گوتم ئەرێ فلانکەس ئەتۆ بۆ لەگەڵ من هێندە ڕوو گرژ و ڕەزاگرانی؟ گوتم وەڵڵا لەبەر بۆ هەرنەهاڵ و بۆ خڵتەکەت.

برادەرێکی بانەیی ئەم شێعرانەی بۆ سیغارکێشان داناوە :

سیغارکێش بۆ حاڵی خۆی دوژمنی ئەوەڵ دوژمنە
زەلیل و بێ تاقەتە، ژیانەکەی وەک مردنە

دەم و چاوی چرچ و ڕەشە، هەروەکوو پیرێژنە
خەڵک ڕووی لێوەردەگێڕێ، بەو حاڵەش خۆی پێ منە

ئەو لەناو مەجلیسدا لەناو دووکەڵی خۆیدا ونە
بۆنی لێدێ وەک دەباغچی، خۆشی پیس و چڵمنە

گەر لەناو جێدا خەوت هەر وەکوو پشیلە مرخنە
ژیانی قرخە و کۆکەیە، ئەو ژیانە مردنە

گەرچی بۆخۆی زۆر زیانە، دوژمنی حالی ژنە
ئەو لە بۆ مال و منالیش دوژمنێکی زۆر ونە
جا دیوار و سەقفی مالیان وا بە دووکەڵ چلکنە
هەرچی لیفە و دۆشەکی هەیە نانە سووتاو و کونە
جێگە دانیشتنێکی رێک، خۆڵەمێش و تووتنە
نافۆکی پانتۆلەکەی وەکوو بێژنگ کون کونە
قوڕ بەسەر ئەو مالە وا ژێر سیغارەکەی ونە
فەوری فریای نەکەوی وەک گوگرە بۆگای بنە
مالەکەت لێ پیس دەکا، چارە هەر بار کردنە
کام ژنە پیسە، کەسیفە، چلکنە یا رشکنە
حەیفە بۆ پیاوی سیغارکێش بۆگەنی بۆنی سنە
گەر لەناو ماشیندا بیخوات وەک تەنوور داخستنە
قوڕ بەسەر حالی موسافیر، حالی وەک حالی منە
کاکە عەولا، کاکە جەعفەر ، ئەسمەر و باجە شنە
کاکە عوسمان کاکە حەیدەر، ئەو دوو خانمە خرپنە
وا لە چنگی تۆ بێزارن، تێک دەنێن بارگە و بنە

# .: بەشی ١٨ :.

سالی ١٣٤٨ی هەتاوی لە ئیدارەی ساواکی زەمانی شای ئێران بانگیان کردم، گوتیان راپۆرتت لەسەرە گۆیا چووی بۆ عێراق. ئەمنیش گوتم : وەڵڵا نەچووم، راستیەکەشی ئەوە بوو کە بە واقیعی نەچووبووم بۆ عێراق. کابرای ساواکی زۆر بە تووڕەیی گوتی : کەوش و گۆرەویەکانت دانێ و سەر ڕووەدا ڕاکشێ، کە ڕاکشام بە هەموو تاقەتی خۆی بەو پەڕی قین لە دڵی دوو باتوونی لە بەرەلاقی ڕاکێشام، ئەوەندەم هێشا هەر دوو قاچم تەزین، گوتم : لێم مەدە ڕاستیەکە دەڵێم. ناچار لە ترسان دەستم کرد بە درۆیان. گوتم : بەڵێ، چوومە قەڵادزێ. ئەو جا لە کۆڵم بۆوە. لەسەر ئەو درۆیە ١٥ ڕۆژان زیندانیان کردم. دوای پرسیار و بژوارێکی زۆر کە بێ

تاوانم و نە چوومە عیراق گوتیان : ببورە و ببەخشە، خەتای راپۆرتدەر و خۆت بوو. دیارە ئەگەر شەیتان و شۆفار لیگەڕێن کەس تووشی ئەزیەت و ئازار نابێ تەنانەت دەسەڵاتداری وەختیش رازی نییە کە بە درۆ و دەلەسە راپۆرت لەسەر خەلک بدرێ، کەوابوو ئەو کەسانەی کە بۆ پارەیەک راپۆرتی بەدرۆ دەدەن خوا خەجالەتیان کات لە دونیا و قیامەت. ئەوەیە کە حەزرەت فەرموویەتی : «بڕواداری بە راستی ئەو کەسەیە کە بڕواداران لە دەست و زمانی ئەمین بن» هەروەها فەرموویەتی «باشترین ئەو کەسەیە کە سوود و قازانجی بۆ خەلک زۆر بێت.»

سەدان فرشتە کە بە پوڵ دەپێون بەرز و نەوی
ماچ دەکەن دەستی کەسێ کە بە خێرە لەسەر زەوی

کەوابوو ئازیزەکەم گوڵ بە و چەقڵ مەبە، بولبول بە و قەل مەبە، چاک بە و خەراپ مەبە، وا بژی خەلک و خوات لێ رازی بن لە دوا مردنیش خەلک درووود و رەحمەتت بۆ بنێرن.

چنان زی کە ذکرت بە تحسین کنند      چو مردی نە بر گورت نفرین کنند
سعدی

# .: بەشی ١٩ :.

دەڵێن تاقەماڵێک دەبێ، شەوێک ژنی کابرا کە دووگیان دەبێ ژانی دێتێ. مێردەکەی هەڵدەستێ، چرا هەڵدەکا و لە ناچاری دەبێ بە مامانی ئافرەتەکە، بە خێر منداڵی دەبێ. کابرا دەڵێ : شوکر بۆ خوا بە سەلامەت خەلاسی بوو، دووبارە ژنە ژانی دێنەوە، کابرا دەڵێ وادیارە دوو قلووی دەبێ. دووبارە لە دەورەی دێت و دەچێ هەتا منداڵێکی دیکەش دەبێ، کابرا دەڵێ ئۆخەش ئەوە لەوەش خەلاسی هات. دووبارە ژنەکە دەست دەکاتەوە بە ژانان، کابرایەکە چرا دەکوژێنێتەوە، ئافرەت دەڵێ کابرا ئەوە بۆ چراکەت کوژاندەوە؟ دەڵێ ئافرەت لەو قسەی گەڕێ بەخوا هەتا ئەو چرایە هەڵبێ لەو کونەڕا هەردێن.

وادیارە ئەو کابرایە فەقیر بووە و گوتوویەتی ئەو هەموو منداڵەم بۆ بەخێو ناکرێن و تەربیەت دانادرێن. عەتتار دەڵێ :

هر کە را اطفال بسیارش بود      در زمانە زاری کارش بود

دەڵێن پیاو ئەگەر منداڵی بوون سێ، سیفەتی بۆ پەیدا دەبێ : مەحزوون و کوێرنان و ترسەنۆک «مَحْزَنَةٌ، مَجْبَنَةٌ، مَبْخَلَةٌ».

بەو مەعنایە دڵی نایە خەرجی بکا دەڵێ با بۆ منداڵەکان بێ، ناوێرێ لەگەڵ کەس دەرگیر بێ هەتا منداڵەکانی تووشی شەڕ و بەزم نەبن، هەمیشە غەمبارە لەتاو منداڵەکانی ئەی نەخۆش نەبن و هیچیان بەسەر نەیێ. بەشەر وا باشە زۆر فکر لە ماڵ و منداڵ نەکاتەوە و هەروەها لە ئەوزاع و ئەحواڵی ژیان زۆر نەکۆڵێتەوە. دیارە ئینسان لە ماوەی ژین و ژیواریدا ساغیش دەبێ ونەخۆش دەبێ، فەقیر دەبێ و دەوڵەمەند دەبێ، ئەمە یاسایەکی یەزدانییە بێ فەرق و جودایی بۆ هەموو کەسێکە. دەڵێن ژانداران لە کابرایەکیان دابوو، کابراش دەیگوت بەڵێ پاسگایە، لێدەدا و دەبەخشێ ... . دونیایە ئینسان دەبێ لەتاڵی و سوێریدا قاڵ ببێ و نەدۆڕێ و نەگۆڕێ. لەدوا هەموو تەنگانەیەک، فەرحانەیەک هەیە. شەوەزەنگی غەم و پەژارە دەربەدەر دەبێ و دەبێتە ئەسیری ڕۆژی ئازادی و شادمانی لێ هەڵدێ، مەولانای ڕۆمی دەڵێ :

ای بـــرادر یـــک دم عقـــل بـــا خـــود آر　　　دم بــه دم در تـــو خـــزان اســـت و بهـــار
غـــم از گـــــردش روزگــــاران مـــــدار　　　کـــه بـــیجـــا بـگـــــردد بسـی روزگـــــار

کەوابوو بەجێ ئەوەی ئینسان ئەم دونیایەی بە فکر و خەیاڵان لە خۆی بکا بە زیندان و لەبن داری بێگەڵای ئاخری پاییز دانیشێ، با هەر بە فکر و خەیاڵ دونیا لە خۆی بکا بە بەهەشت و لەناو گوڵ وگوڵزار و لەبن داری پڕ گەڵا و ڕازاوەی بەهار بیگوزەرێنێ و «شای بە سەپانی خۆی نەزانی».

مرۆڤ نابێ ئەهلی خەم بێ　　　بە ڕووداوان نــابێ خــەم بــێ

مەرد بێ لە گۆڕێ، هەرگیز نەگۆڕێ

## .: بەشی ٢٠ :.

دەڵێن ساڵێک کابرایەک دەچێ بۆ حەج، خێزانەکەی ناوی پووره ناز دەبێ. دوای ئەوە کە مێردەکەی لە حەج دێتەوە پووره نازێ دەچێتە لای پۆلێک ژن کە لە کۆڵان دانیشتبوون. پێی دەڵێن پووره نازێ چۆنی؟ ئەویش دەڵێ یاخوا مبارەک نەبێ ئەو هەموو پووڵەمان خەرج کرد و

ئێستا هەر لە پوورە نازێ تێنەپەڕیوم و نەبوومە حاجی ژن. هەروەها ڕۆژێک خێزانی خالە پیرەیەک دەیگوت فلانکەس کابرایەکەم شەوێ خۆ لە من دەمرێنێ و ڕۆژێش دەڵێی گورگە.

جارێکیان پۆلێک جحێڵ دەگەنە پیرێژنێکی پیری بەساڵداچوو. دەڵێن پووری ئێستا پێت خۆشە قاپێکت هەڵوای گەرم بۆ بێنن یا مێردێکی جحێڵ بکەیەوە؟ پیرێژن دەڵێ : جا ڕۆڵە کوا ئەمن تازە دەدانی هەڵوا خواردنم ماوە. بە ڕاستی نەقڵی پیرێژنان زۆر و زەبەندن. نیوە نیوە دەیانگێڕینەوە، دیارە عالەمی پیرەژنانیش سەیر و خۆشە لەگەڵ ئەوەش خوشکە گەنجەکان دەتوانن لە تەجرەبە و ڕابردووی ئەوان پەند و ئامۆژگاری وەربگرن و ڕێز و قەدریان لێ بگرن و پێیان ڕانەبوێرن، بە ڕاستی ئەوانیش ڕۆژێک دەگەنە ئەو قۆناغە و پیر و غەریب دەبن.

جارێک لە گوندێک میوانی پیرێژنێک بووم، نیوسەعاتی ڕۆژ مابوو، لەو کاتەدا پوورە ناز چووبوو بۆ کانی؛ مەنجەڵێکی دەستە لەسەر ئاوری بوو. سوتفە ئاورەکەی کوژابۆوە، ئەمنیش هاتم یەک باوەشم چیلکە و دار وەبەر نا و ئاگر خۆشبوو، قرچە قرچی دەگەیشتە ئاسمان. پوورە ناز کە لە قۆتان هاتەوە خێرا گۆزەکەی دانا و بە قەڵسییەوە گوتی : ئەوە چ سەگبابێک ئاورەکەی خۆشکردووە یاخوا دەستی شکێن. گوتم وەڵڵا ئەمن، دەستیکرد بە بۆڵەبۆڵە گوتی : بەلای ناخێرم پلاوم لێناوە بۆ دروێنەوانان، ئاورم لێکوژاندبۆوە هەتا دەم بکێشێ، جا قڕۆکەم بەسەری چ بکەم. لەم نەقڵەدا ئەو دەرسەمان دێتە دەست کە ئینسان نابێ کوێرکوێرانە دەست لە کاروباری خەڵکەوە بدات. ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی.

# .: بەشی ٢١ :.

ڕەحمانی برام لە مەقامی شۆخیدا دەڵێ : خوا وەک ئاگر وایە، ئەگەر زۆری لێ نزیک ببیەوە دەتسووتێنێ و ئەگەر زۆریشی لێ دوور ببیەوە سەرما دەتکوژێ، کەوابوو نابێ زۆر نە نزیک و نە زۆر دوور بی لێی.

بەو مەعنایە ئینسان نابێ تەنیا هەر لەگەڵ دوونیا و عەیش و نۆش خەریک بێ و کاری بە خوا و خەڵک نەبێ. بێگومان مرۆڤی باش و بە کەڵک ئەوەیە کە بۆ خوا بێ، بۆ خۆی بێ، بۆ گەل بێ، ئەگەر وا نەبێ مەوجوودێکی بێخێر و سەرباری گەلە. حەزرەت فەرموویەتی «پیاو ئەو پیاوەیە هەم پیاوی دنیا بێ هەم پیاوی قیامەت» هەروەها دەفەرمێ «لە ڕەحمەتی خوا دوورە ئەو کەسەی کە خۆی دەکاتە سەرباری جامیعە.»

جارێک باوکێک ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد، دەیگوت رۆڵەم ئەوەی لە توانات دایە لە خزمەتی فەرد و کۆمەڵ دەغڵی مەکە، بە تێکڕا بۆ گەل و هۆزت غەمخۆر بە، بە داهاتووی خۆت گەشبین بە، یار و یاوەری چینی چەوساوە و هەژار بە، هەروەها لەگەڵ کەس بۆ تەماعی دونیا خۆت دەرگیر مەکە، ئەگەر هەر تووشبووی بە هەر هۆیەک بێ، خۆت رزگار کە؛ لەگەڵ ئینسانی بەد و بێ ئەخلاق رەفاقەتی مەگرە چونکە رەفیقی خەراپ بەرەو فەساد و بێ بەند وباری و داوێن پیسیت دەبات و تووشی سەدان داو و تەڵەت دەکا. بە قەولی هەژار :

رەفیقی خەراپ لەبەری هەڵێ روو رەشی پیوە، ماچی مەنجەڵێ

سەعدی دەڵێ : جارێکیان لە دووپشکیان پرسی بە زستانان بۆ دیار نی، لەجوابدا گوتی : بە هاوینان هێندە رەزا سووکم هەتا زستانانیش بێمە دەرێ.

ئەوە مەعنای وایە ئینسانی خەراپ لە دوو لا دزێوی لای خوا و خەڵکە، بێخێر و بێ کەلکە.

(ماری دێمی باشترە ئامان لە ئینسانی بەشەڕ
گەر بەشەر ئاوا بەشەڕ بێ تف لە ملوێنێک بەشەر)

# .: بەشی ٢٢ :.

دەڵێن کابرایەک میوانی ماڵێک دەبێ، شەوی ئەوەڵ زۆری رێز لێدەگرن و دۆشەکی بۆرادەخەن، راشەوێ دەچێتەوە کابرا بە خێزانەکەی دەڵێ ئافرەت ئەمشۆ دۆشەکی بۆ رامەخە. میوان دەڵێ کورە دۆشەک چییە، ئەو نەرمە فلیقە رایدەخەن. راشەوێ دیسان میوان لەوێ قوت دەبێتەوە، کابراکە بە ژنەکەی دەڵێ واباشە بیکەین بە بەزم و هەلا. دەڵێن ماڵی بە جەنگ میوانی لێ ئامینێتەوە. کابرا بە ژنەکەی دەڵێ ئەوە بۆ مانگاکەت نەدۆشیوە؟! ژنەش دەڵێ ئەی تۆ بۆ گوێرەکەکەت نەبەستۆتەوە؟! هەموو شیرەکەی خواردوە. بە کورتی قسێک لەم و قسێک لەم، کابرا رێماڵی ژنەکەی دەکا لێیدا، کابرای میوانیش لەو بەینەدا هەڵدەستێ و دەچێ بۆ پاشخانی و لەوێ خۆی مات دەکا. کابرا بە ژنەکەی دەڵێ ئافرەت! ئەوە شوکر بۆ خوا میوانەکەمان لەکۆڵبۆوە، خۆ چەند رۆژە ئەمە لەبەر ئەم میوانە خواردن و سەرجێمان نەبووە. جا بە شادمانی ئەوەی کە میوانەکەمان فنکاوە هەڵوایەکی زەریف دروست بکە. ژنە یەک تاوە هەڵوا دروست

دەکا. کابرا دەڵێ ئافرەت دەستت خۆش بێ، برۆ لە پاشخانێی دانێ هەتا بۆمان سارد بێتەوە، لە خۆشیان دوو سێ گێڕ هەڵدەپەڕین. دەستیان تێک گرت و شاییان گەرم کرد. کابرا بە ژنەکەی دەگوت ئەرێ ئەمن وەکوو کێ دەچم؟ ژنەکە دەیگوت وەک یوسف دەچی، وەک لاسێ دەچی، وەک سیامەندی دەچی. وەک ماڵماڵ دەچی، وەک شێخ فەرخ دەچی، وەک مەجنون دەچی. ژنەکەش دەیگوت ئەدی کابرا ئەمن وەک کێ دەچم؟ گوتی تۆش وەک لەیلا دەچی، وەک زولەیخا دەچی، وەک سێوێ دەچی، وەک خاتوو زینێ دەچی، وەک خەزاڵێ دەچی. لەو بەینەدا کابرای میوان کە هەڵواکەی هەموو خواردبوو تاوەکەی بەسەری خۆی رۆکردبوو هاتە دەرێ و گوتی ئەی ئەمن وەک کێ دەچم؟! گوتیان تۆش وەک سەگبابی هەڵواخۆر دەچی.

لەم نەقڵەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئینسان لەهەر جێیەک میوان بوو، دەبێ ریعایەتی ماڵی خانەخوێکەی بکا و زیاد لەدەر نەمێنێتەوە و نەبێتە ئەسبابی زەحمەت، چونکە ئەو ماڵە کار و ئیشیان هەیە و پێویستیان بە هەموو جۆرە ئیستراحەتێک هەیە.

# .: بەشی ٢٣ :.

دەڵێن کابرایەکی زۆر قسەخۆش و پیاوچاک، دڵخۆشی برادەرێکی دەداتەوە کە زۆر مات و مەلوول دەبێ. پێی دەڵێ : ماڵت خەرا نەبێ، ئەرێ ئەتۆ بۆ وا دونیات لە خۆ تەنگ هەڵێناوە، دەڵێی ئەستێرەت بە ئاسمانەوە نەماوە، دەڵێی رۆژی هیوات لە ئاسۆ ئاوا بووە و جارێکی دیکە هەڵنایەتەوە، دەڵێی لە بن دارێک دانیشتووی گەڵای پێوە نەماوە، دەڵێی کەشتیت لە نێو گێژاوی دەریادا لێ نۆقم بووە، دەڵێی سەڵاو قەت کەست نەماوە، دەڵێی لوتی مەیموون مردووی، دەڵێی جووی شەمۆتە، دەڵێی لە زیندانی تەک سلوولیدای، دەڵێی لە بن داری نەمان و هەڵاوەسراوی، دەڵێی هیچت نییە و نانت بە ساجێدا سووتاوە، دەڵێی شەش دەرت لێگیراوە و ئەو دونیایە پان وبەرینەت لێبۆتە کونە مشک، دەی تۆزێک پێبکەنە و گەشە و نەشەت بجووڵێنە و تۆزی خەم و پەژارە لە خۆت بسڕەوە و ژەنگە سوورەی فکر و خەیاڵان لە خۆت بتارێنە و برەوێنە بە یادی یەزدان زامی دڵ و دەروونت سارێژ و ساخاو بکە، بە قەولی مەولەوی :

هیچ گنجی بی دد و بی دام نیست      جز بە خلوتگاە حق آرام نیست

هەروەها ئەو شیعرانەی بۆ خۆشی بۆ خوێندنەوە:

لــــە کـــۆڕی عــاشقـان رۆژی لـەوەبـەر بـولبـوولـــم بـینی
عەجەب مـابووم کـــە ئـەو بـۆچـی لـە شـاخ و نەغمە تۆراوە
گوتی مەعشووقی من گوڵ بوو بەهاران، خۆ لە دەست دەرچوو
تـەمـاشـــا کـە پـەڕ و بـاڵم بـە نـــاری هیـجـرە سـووتـــاوە
لـە لایـەک قـاسپە قـاسپی کـــەو، لـــە لایـەک هـاژەیی ئـــاوە
دەخیلـــە ســـاقیـــا تـێکـە لـــە ئـــەم شـــیرینـە بـــەفـــراوە

زانایەک دەڵێ لەناو دەروونی ئینساندا دوو هێزی زۆر قەوی هەن. یەکیان هێزی عەقڵە، ئەوەی تریان هێزی نەفسە. ئەوانە هەمیشە لەگەڵ یەکتر بەربەرەکانیانە و دژ بە یەکن، بە واتایەکی‌تر هێزی موسبەت و هێزی مەنفی. هێزی موسبەت بە شێوەی ئامۆژگاری پێت دەڵێ دڵت قەوی بێت و لە ژیاندا خەمۆکی مەبە و هەمیشە بە گەشە و نەشە بە و زۆر فکر لە کار و بارت مەکەوە و گەشبین بە و رەشبین مەبە و دونیا لە خۆ وەتەنگهەڵمەیەنە. جا کە مرۆڤ بە قسەی بکات ئەوە خۆشبەخت و بەختەوەر دەبێ؛ بەڵام هێزی مەنفی بە پێچەوانە دونیات لێدەکات بە بەندیخانە، دەڵێ ئەستێرەت بە ئاسمانەوە نەماوە، ئەم دونیا پان و بەرینەی لێوەتەنگهەڵدێنی هیچ خۆشی و ئومێدی بۆ ناهێڵێتەوە، ئەوەیە کە زۆر کەس لەو حاڵەدا خۆیان تووشی خۆکوژی دەکەن، پەنا بە خوا لەو شتانە کە ئینسانی بەرەو هیلاک دەبەن.

## .: بەشی ٢٤ :.

دەڵێن کاتێک کە تەیمووری لەنگ وڵاتی بابلی گرت، خەڵک لە ترسی شەڕی تەیموور شاریان چۆڵکرد. تەنیا یەک نەفەری لێمابوو. تەیموور لێی پرسی خاڵە مەگەر نازانی لەشکری تەیمووری لەنگ هاتووە، ئەتۆ چۆنە بەتەنێ لێرە ماویەوە، مەگەر ناترسی؟ گوتی ئەمن خوای سەر ئەرزم، خوا نابێ لەکەس بترسێ. تەیموور گوتی مادام کە دەڵێی خوای دەبێ کشگێڕ و موعجیزەت هەبێ، دەنا دەستوور دەدەم بتکوژن. گوتی لێت بێ منەتم، هەرچی دەڵێی وادەکەم. تەیموور گوتی کچێکم هەیە لە زگ و مانگەوە زاری بچووکە، ئەگەر بۆی گەورە بکەی ئەوە دەڵێم راست دەکەی، دەنا شەق دەزانێ قۆناغ لە کوێیە؟! خاڵە گوتی ئاخر ئێمە دوو خواین، من خوای ئەرزم، ئەوی کەش خوای ئاسمانە، کارەکانمان بەشکردوون، لە نێوکی بۆ سەرەوە

حەواڵەی خوای ئاسمانە، لەوێش بۆ خواری حەواڵەی منە، جا ئەگەر کونی خوارێی بچووکە هەتا بۆی گەورە بکەم، تەیموور زۆر پێکەنی و گوتی ئەوا هەموو خەڵکی شارەکەم بە تۆ بەخشی.

دەڵێن جارێک تەیموور دەچێ بۆ لای حافزی شیرازی تەماشا دەکا کراسێکی دڕاوی لەبەردایە، تەیموور دەڵێ ئەتۆ لە شیعرێکدا گوتووتە :

اگر آن ترک شیرازی به دست آرد دل ما را

به خال هندوش بخشم سمرقند و بخارا را

کەچی بۆخۆشت ئەو کراسە شڕۆڵەت لەبەرە، حافز دەڵێ :

ئاخر لەبەر سەخیەتی بۆ خۆم هیچ شتێکم بۆ نەماوە. مێژوو دەڵێ تەیموور زۆر زاڵم بووە، لە کەللەسەران منارەی دروست کردووە و تەنیا سەید عەلی کورد بووە کە لە کرماشان شەڕی چریکی و پارتیزانی لەگەڵ کردووە، لێی نەترساوە و بوێرانە لە بەرامبەریدا هەڵوێستی گرتووە. دیارە دوا ڕۆژی زاڵمان هەر نەدامەت و بەدبەختی و ڕۆژڕەشییە. هەروەها لەناو مێژوودا بۆ هەمیشە بەش و باریان هەر تووک و نەفرینە، هەر وەکوو شاعیر لەو بارەوە گوتوویەتی :

ئـەوەی مـاوە هـەر نـاوە بـۆ پیس و پـاک

بـە دوویانەوەیە تـا هـەیـە ئـاو و خــاک

لکا نـاوی بـەدفـەڕ بـە سـەد جـوێـنـەوە

هــەزار تــووک و نـەفـرینی بــە شـوێنەوە

بەشی پـیـاوی بـاش ئـافــەرین و نــەزان

لـە خـۆشی ژیـاندان کـە خـۆشـیان ڕزان

## .: بەشی ٢٥ :.

دەڵێن جارێک ڕەخنەیان لە مەولانای ڕۆمی گرت و گوتیان تۆ دەڵێی :

چو خواهـد بـر کشـد تیـغ بـلالـک؛ بـە مـاهـی گاو گوید کیف حـالـک؛

«کیف حالک» بە پێی ڕێزمانی عەرەبی موێتەدا و خەبەرن، دەبێ «کیف حالُک» بێ، ئەگەر واش بخوێنرێتەوە بە رەوییە و قاعیدی شێعر ئیرادی دەبێ. مەولانا گوتی خۆ ئەوە قسەی من نییە، قسەی گایە، دیارە گاش سەرف و نەحو نازانێ.

جارێکیان نەفەرێک لە بەغدا دەچێ بۆ «قوم» بە خەلیفە دەڵێ کارت نییە بۆ لای قازی «قوم»، خەلیفەش ئەو شێعرە بۆ قازی دەنووسێ :

أَيُّـهَا الْقَاضِي بِقُـمْ قَـدْ حذِلناک فَقُمْ

واتە ئەی قازی قومێ ئەوا ئەتۆم لەسەر کار لابرد و هیچ کارە نەمای. قاضی کە ئەو شێعرە دەخوێنێتەوە زۆر ناڕاحەت دەبێ و دەڵێ : لَعْنَةُ اللهِ عَلَى الْقَافِيَة، واتە نەفرین لە قافیە.

دەڵێن کابرایەک میوانی زۆر دەهاتن، ژنەکەی فەرقی پێ نەدەکردن؛ واتە هەر میوانێک کە دەهات نان و چێشتی باشی بۆ ساز دەکرد و لە دەوریان دەهات و دەچوو. کابرا پێی گوت ئافرەت ئاوا نابێ ئەتۆ هەر میوانێک هات، قوولْ تێڕا دەچی و بەخێری دێنی، نازانی میوان سێ جۆرن، ئی وایە دەبێ مریشک و پلاوی بۆ لێنێی، ئیوایە دەبێ هێلکە و رۆنی بۆ ساز کەی، ئیواشە دەبێ نان و دۆیەکی خاڵی بۆ دانێی. ژنەکە گوتی جا کابرا من ئەو سێ جۆرە میوانانە چۆن لێک کەمەوە؟! کابرا گوتی هەر کات میوانی زۆر خۆشەویستم هات دەست لەسەر چاوانم دادەنێم، ئەگەر میوانی مامناوەندیم هاتن دەست لەسەر سینگم دادەنێم بەڵام ئەگەر میوانی خوێڕیم هات دەست لەسەر خوارەوەی نێوکم دادەنێم، جا ئەوە قەرینە بێت. ژنەکەی گوتی ماڵت ئاوا بێ ئەوجا حاڵی بووم.

دیارە میوان دەبێ فەرقی پێ بکرێ، بە قەولی دەڵێن : هەرچە سمێڵی سوور بوو هەمزاغا نییە، میوانی بەڕێز و عاقڵ هەیە و میوانی سووک و نەزانیش هەیە، میوانی زانا پێزانە و لە قەدەر خۆی خانەخوێ نارەحەت دەکا، میوانی نەزان پێنەزانە و خانەخوێ وەڕەز و ئەزییەت دەکات. بۆ نموونە دەڵێن کابرایەکی نەزان و سەربار میوانی ماڵێک دەبێ، چەند رۆژێک دەمێنێتەوە خانەخوێ وەڕەز دەبێ و دەڵێ :

کـشـە کـشـە مـریشکـە رەشـە میوان شەوێک، دوو شـەو خـۆشە

میوان لە جوابدا دەڵێ :

کـشـە کـشـە مـریشکـە لارێ مـیـوانـم هـەتـا بـەهـارێ

# .: بەشی ٢٦ :.

دەڵێن بە کابرایەکیان گوت داری حەیات هەیە، هەر کەس لێی بخواتەوە نامرێ، کابراش زۆری حەز لە تەمەن درێژی بوو، دەستی کرد بە پرسیار و بژوار لە بارەی ئەو دارەوە. لام وایە لە لای هیندوستان دەبێ، لە کابرایەکی پیر دەپرسێ : ئەرێ خاڵەگیان دەڵێن داری حەیات هەیە؟! داخوا پێی نازانی؟ خاڵە گوتی ئەو دارە داری عیلم و زانیارییە، هەر کەس لێی بخوات قەت ناوی کوێر نابێتەوە لە ناو لاپەڕەی مێژوودا هەر دەمێنێ و هەمیشە چین و وەچەی دوای خۆی یاد و بیری بەخێر دەکەن، ئەوەیە مانای داری حەیات. جا خۆش بە حاڵی ئەو کەسانە کە کەسبی عیلم و زانیاری دەکەن و بەو زانیارییەوە خزمەت بە گەل و نیشتمان دەکەن وەک شەم بۆ گوڵ دەسووتێن و دەبن بە چرای رزگاری بۆ شەوەزەنگی نەزانی و رۆژرەشی، نەک ببنە ئەسباب و هۆی ئەزییەت و ئازار و دواکەوتن و وێرانی گەل و نیشتمان.

بە داخەوە ئەمڕۆ زۆرێک لەدەوڵەتانی زلهێز، بە هۆی بەرهەمەکانی عیلم و زانیاری غایەیان هەر کوشتن و کوشتار و چەوسانەوە و ماڵوێرانکردنی خەڵکە، تەنیا خۆش گوزەرانی و زۆرەملێ و داسەپاندنی خۆیان مەبەستە و بەس.

ئەوەیە کە ئەمین گوتوویەتی :

دیـــارە زاڵمان گـورگـــی مـــەڕ خـــۆرن
ســـا هــەوری رەشـی بـەرچـاوی خۆرن

مایـەی هــەوێنی گشت شـــەڕ و شـــۆڕن
بۆیە لـە لای گـەل، پـەست و سەر شۆڕن

تەوێڵ بـە خـوێنن واتـە جـووت مۆرن
دژی جـــەمـــاور تـــامـــار و مــۆرن

هــەر چـەند بە رواڵەت وەک چیای نۆڕن
بــۆ رۆژی رەشـیـــان دەبـــێ بـنـــۆڕن

نـەفـرین لـــەوانـەی کــە وا لـــە گـۆڕن
لـەگـــەڵ ئـەوانـــەی کـــەوا لـــە گـــۆڕن

ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی لەگەڵ برادەرێک دەچووین بۆ تاران. لە کەرەج گرتیانین، ئەمن چوار بەستەم دینار پێبوون. دیارە زەمانی شا دینار زۆر قاچاخ بوون، خولاسە لێیان گرتم گوتیان ئەوە چییە؟ هاوڕێیەکەم گوتی ئەوە سابوونن، بۆ سەوقاتیان ئەمنیش هاوارم کرد گوتم نەخەیر، ئەوە دینارن چون دەمزانی لێم ئاشکرا دەبن، سەرهەنگ گوتی چونکە راستیت گوت لێت ناگرم، ئەینا بە جەریمەیەکی زۆر و چەند ساڵ زیندانی نەبووایە خەلاست نەدەبوو.

ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی لە سەفەری حیجاز حاجییەکی شەڕانیمان لەگەڵ بوو ئەگەر قەلس دەبوو دەیگوت لێرە دەنگێ ناکەم هەتا دەچینەوە سەردەشتێ.

بێگومان ئینسانی لەشەڕ بەشی هەر شەڕە، ئینسانی ساوێلکە و فەقیرحاڵیش بەشی هەر خێر و بێرە و حیسابی سووک و ئاسانە، «اِنْ شَرّاً فَشَرٌ و اِنْ خیراً فخیرٌ.»

# :. بەشی ٢٧ :.

دەڵێن جارێک پۆلێک مەلا میوانی مەلایەک دەبن. شەوێ مەلاکان غەیبەتی خەلیفەیەک دەکەن، دایکی مەلای خانە خوێش دەروێشی خەلیفە دەبێ، کە گوێدەگرێ ئەوا مەلاکان پاشەملەی خەلیفە دەکەن، خێرا دەرگا دەکاتەوە و دەڵێ : مەلاینە بۆ غەیبەتی خەلیفە دەکەن، خۆ دایکی هەمووانتانی والێکردووە، بێخەبەر لەوە کە خۆی دایکی مەلایە و لە پێشەوە وەبەر خۆی دەکەوێتەوە.

دەڵێن پیرێژنێکی دیکەش مریدی شێخێک دەبێ، رۆژێکیان دەیهەوێ بچێ بۆ زیارەتی شێخ. مەلای کۆیە پێی دەڵێ بۆ لە ماڵی خۆت لەبەر خوا ناپاڕێیەوە؟ پیرێژن بە قسەی ناکات و دەچێ بۆ زیارەتی شێخ، گۆیا پیرێژنێکی جوانیش دەبێ و شێخ تەماعی تێدەکات، کاتێک کە دەگەڕێتەوە مامۆستا خەبەری دەزانێ پێی دەڵێ پێم نەگوتی پوورە ئەستی حەزرەتی شێخ تێدەکوتێ.

دەڵێن «لیباسی بە ئارەزووی خەڵکی بکە، بەڵام خواردنی بە ئارەزووی خۆت بخۆ.» بە راستی زۆر جوانە دەڵێن «نانت جۆیین بێ و خوڵقت گەنمین بێ.» دەڵێن «میوانی سەعاتێکی، چاوەشی ساڵێکی.» ئەوەیە شێخی سەعدی گوتوویەتی :

غریب آشنا باش و سیّاح دوست　　　کـه سیّاح جلّـاب نـام نکوسـت

جارێکیان میوانی پیرێژنێک بووم، زۆرم برسی بوو، نان و ماستاوێکی بۆ هێنام. ماستاو هیچ تامی نەبوو، پیرێژن لەگەڵ کاران خەریک بوو، ئەمنیش بەرەکەم هەڵدایەوە کونێکی لێبوو ماستاوەکەم پێداکرد و خۆم رزگار کرد.

جارێک پیرێژنێک پێی گوتم : دەڵێن کاکم بۆتە «کونی سون» بە قسەی خۆی دەیگوت بۆتە کۆمۆنیست.

ساڵی ١٣٦٥ی هەتاوی لە تاران لە مەیدانی فیردەوسی چاوەڕوانی تاکسی بووم، سەوارییەک هات گوتی : کجا میری؟ گوتم : میدان توپخانە، گوتی : بیا سوار شو، سێ نەفەر لە دواوە سوار بوون، یەک نەفەریش لە پێشەوە. ئەمن لە بەینی رانەندە و ئەو نەفەرەدا سوار بووم. نەفەرێک لە دواوە گوتی : آقای راننده در بسته نشده. رانەندە خۆی سەرهاویشتم هەتا دەرکەکە داخات، دوو جار دەرکەکەی بە توندی لێکردەوە و پێوەدا، کابرا گوتی : در بسته شد، ئەوە نازانم کە سەد هەزار تمەنم لە گیرفاندایە لەو بنەوەدا دەریان هێنابوو، دیارە سەد هەزار تمەنی ئەو کات سەد ملوێنی ئێستا بوو. بە هەر حاڵ مەبەست لەو نەقڵە ئەوەیە پیاو دەبێ لەو شارانە ئاگای لەخۆ بێ؛ فرت و فێڵ زۆرن، بە تایبەت لە شاری گەورە، فێڵباز و ساختەچی ئەوەندە زۆرن نەهەنگی قوت دەدەن و رۆدێڵن.

# .: بەشی ٢٨ :.

دەڵێن کابرایەک میوانی ماڵێک دەبێ چێشتی ترخێنەیان دەبێ، کابرای خانەخوێ زۆر تەعریفی ترخێنەکە دەکات و دەڵێ ترخێنە وا و وا خۆشە. کابرای میوانیش دەڵێ هێندەی مەتح مەکە با نەیڕێژم.

وا دیارە ئەوانە شۆخیان پێکەوە هەبووە و بە قسەی یەکتر قەڵس نەبوون. دیارە قەدیم ئەو شۆخی و جەفەنگانە لە کۆڕ و مەجلیساندا زۆر بووە، تەنانەت گەورەپیاوەکانیش شۆخیان پێکەوە هەبووە.

دەگێڕنەوە جارێکیان فەقییەک دەچێتە لای شێخ مەحموودی نەمر و دەڵێ قوربان هاتووم بۆ خزمەتت کە لە گوندێک بمکەی بە مەلا رەمەزان. شێخیش دەڵێ باشە ئەوە لەسەر مارە رەشێم دانای. فەقێش دەڵێ قوربان ناکرێ لەسەر قوولە رەشێم دانێی. شێخیش پێدەکەنێ و

دەڵێن چونکە ئاوا حازر جواب بووی ئەو رەمەزانە مەلای خۆم بە. با ئەوەش بڵێین مارەرەش و قوڵە رەش دوو گوندن لە عێراق.

دەڵێن کابرایەک چۆ ماڵێک ترخێنەیان لەسەر ئاوری بوو، تەماشای کرد هەموو شتێکی تێدایە. ئەویش چوو کەوشە کۆنێکی تێهاویشت، گوتیان ئەوە بۆ واتکرد؟ قووتی عالەمێکت بڕی، گوتی وەڵڵا هەموو شتێکی تێدا بوو تەنیا لینگە کەوش نەبێ. دەڵێن ترخێنە میوان بەڕێکەرە. دەڵێن دوکتۆرێک سەلکە ترخێنەیەکی ئازمایش کرد سەد میکرۆبی تێدابوو.

ساڵێکیان لە سلێمانی چووم بۆ حەمام. ئەگەر تەماشام کرد زۆرم پێ سەیر بوو. واتە پیاوەکان فۆتە و شۆرتیان لەبەر نەبوو، ئەمنیش گەڕامەوە و بە حەمام چییەکەم گوت : کاکە پارەی حەمامەکە چەندە؟ گوتی دە دینار، گوتم ئەوە دە دینار پارەی ئاوەکە، دە دینارت دەدەمێ ئیجازەم بدە دەڕۆم، پێکەنی و گوتی هەر دە دیناری ئاوەکەم دەیە و بەس.

ئینسان وا باشە لەهەر جێیەک بێت ریعایەتی ئەدەب بکا و بە رووت و قووتی خۆی نەکاتە تەماشاچی و سەیری خەڵک. شەرم و ویقار لە خەڵک جوزوی فەرهەنگی جوانی لەمێژینەی گەلی کوردە، دیارە بەقا و مانەوەی هەر گەلێک بە راگرتن و پاراستنی داب و فەرهەنگیەتی، هەر سەربەرز و سەرکەوتوو بێ.

دەڵێن ژنێک هەموو رۆژێ بە بووکەکەی دەگوت ئاگات لەخۆ بێ گۆزەکەی نەشکێنی، سوتفە گۆزەکەی لێ شکا. خەسوەکەی دەنگی نەکرد، بووکەکەی زۆری پێ سەیر بوو، گوتی : ئامۆژن ئەتۆ هەموو رۆژێ بە منت دەگوت گۆزەکەی نەشکێنی، کەچی ئەمڕۆ کە شکاندم دەنگت نەکرد. گوتی : ئەم پێگوتنەم بۆ ئەوە بوو گۆزەکە نەشکێ، ئێستا کە شکاوە نالێم بۆ شکاندت. دیارە ئینسان هەتا شتی بە ساغی لەدەسدایە ئاگای لێبێ چاکە، ئەینا کە لە دەس دەرچوو نە خەفەتی لێ بخوا و نە بڵێ بۆ وای لێهات، بە قەولی کوردی «لەدوا چوان نەچین.»

## .: بەشی ٢٩ :.

کابرایەکی شێت و ناتەواو گوتی فلانکەس ئەگەر ئینسان تووشی لە کابرایەکی بێعاقڵ کەوت چبکا؟! منیش بە زەردەخەنەوە گوتم لەبەری هەڵێ.

دەڵێن کابرایەک هەڵدەهات، وتیان بۆ هەڵدێی؟ بۆ شێر و پڵنگت بەدواوەیە؟! گوتی لەوان خەراپتر، کابرایەکی نەزانم بەدوایەوە.

دەڵێن باشترین رەفیق عەقڵە و خەراپترین رەفیق نەزانییە. «صَدِیقُ کُلُّ امْرِءٍ عَقْلُهُ وَعَدُوُّهُ جَهْلُهُ». سەعدی دەڵێ :«اگر به مَثَل عقل منعدم گردد، هیچ کس به خود گمان نبرد که نادانم.»

ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی چوومە هەواری مەیدان چۆغە. دیارە کوێستانێکی زۆر بەرز و باسەفایە.

له میدان چۆغەی بەچیغ و رەشماڵ　　منـی دەلاوان شـنەی بـای شـەماڵ
چەند سارد وسۆڵە دۆی مەشکەنێری　　بەلەنجـه و لارە دەیژێنـن بێـری

لەوێ بە شۆخی لە ماڵێکم پرسی : ئێوە بە زۆری گۆشتی چ دەخۆن؟ گوتیان : گۆشتی بزن گوتم :

هێنـدەی بخـۆن گۆشـت بـزن　　بۆیــه وەهـــا چـــاو بـــزن

هەروەها لە ماڵێکی دیکەشم پرسی: ئێوە بە زۆری گۆشتی چ دەخۆن؟ گوتیان : گۆشتی مەڕێ گوتم :

مژدێنییــه ئــەو شــەکە　　بیـدا بـه تـۆ ئـەو شـەکە

بە راستی کوێستان و هۆبە و هەوار زۆر خۆشن، خەم و پەژارە لە دڵی ئینسان لادەبەن و باوەشێنی دڵانن.

دەڵێن کابرایەک دەچێتە دووکانێک لامپی شەوخاب بکڕێ بەڵام نێوەکەی نازانێ. دەڵێ : کاکی دووکاندار لامپێکی شەوتاریکم دەیە، دووکاندار دەڵێ لامپی شەوتاریک چییە؟ دەڵێ بیلامانا ئەوەی کە شەوێ کاری شەرعی لەبەر دەکەن.

هەژار دەڵێ : جارێکیان چوومە گوندێک عەجەمی لێبوون، کوێخایەکیان هەبوو بە ناوی مام پیرۆت؛ فارسی لەگەڵ دەگوتن، پێم گوت :

کـوچکت لیبـاری پیـرۆتە گـیـژە　　ئـەم فلتە فلتەت بـە کـوردی بێـژە

جارێکیان لە مامۆستا هەژاریان پرسی : ئەرێ بە تورکی بە پیسایی دەڵێن چێ؟ گوتی لەسەر زاریمە بەڵام لەبیرم چۆتەوە.

دەڵێن عەجەم تووشی کابرایەک دەبن گوتیان: کجا میری؟ گوتی : خواجەمیر، گوتیان : چرا؟ گوتی چرام نییە، گوتیان : چطور؟ گوتی : تەوریشم نییە.

دەڵێن فارسێک لە ماڵی کوردێک میوان دەبێ بە خانەخوێکەی دەڵێ : نان و کەرەم بۆ بێنە، ئەویش دەچێ گوێدرێژەکەی و دوو سێ نانانی بۆ دێنێ، کابرای فارس دەڵێ ئەوە چییە؟ دەڵێ خۆت گوتت کەرە و نانم بۆ بێنە.

جارێک پیاوێکی کورد هاتە دوکان. دوو سێ منداڵیشی لەگەڵ بوون؛ فارسیان دەگوت. گوتم کاکە وادیارە کە تۆ کوردی؛ بۆ منالەکانت بە فارسی قسان دەکەن؟ گوتی لە شاری کەرەجم. هەموو فارسن، بۆخۆم کوردیم لەگەڵ نەگوتون. ئەمنیش بە قەلسییەوە پێمگوت خەیانەتێکی گەورەت بەو منداڵانە کردووە کە زمانی زگماکیت فێر نەکردوون. جا بەخۆشت دەڵێی کورد؟ ئەوجا ئەم شیعرەی حاجی قادری کۆییم بۆ خوێندنەوە کە دەڵێ :

ئەگەر کوردێک زمانی خۆی نەزانی     موحەققە دایکی حیزە و بـا بیزانی

دیارە زانینی هەر زمانێک پێویستە بە تایبەت زمانی رەسمی هەر وڵاتێک بۆ خەڵکەکەی، دیارە ئەگەر ئەوانە بە باشی زمانی فارسیان زانیبایە تووشی هەڵە و سەهوو نەدەبوون، ئەوەیە کە دەڵێن ئینسان چەند زمان بزانێ ئەوەندە بەشەرەیە. کەوابوو ئەی گەنجەکان لە فێربوونی زمانەکان تەمبەڵی مەکەن، بە تایبەت زمانی رەسمی وڵاتەکان و دوای ئەو زمانی ئینگلیزی. هەر سەرکەوتوو بن.

# :. بەشی ۳۰ :.

دەڵێن بەحری عیلم بە پێچەوانەی بەحری ئاوە، بەحری عیلم لە قەراغیەوە دەخنکێنێ بەڵام بەحری ئاو لە نێوقەدیەوە. بە داخەوە ئەمڕۆ زۆرێک لە زانایان لە قەراغی بەحری عیلمن بۆیە زەرەریان زۆرترە لە قازانج بۆ خۆیان و گەلەکەیان.

دەڵێن جارێک دوکتورێک لەگەڵ نەفەرێک بە لای قەبرستانێکدا دەڕۆن، دوکتور رووی لە قەبرەکان وەرگێڕا. کابرا گوتی دوکتور بۆ رووت وەرگێڕا؟! گوتی وەڵڵاهی رووم نەبوو تەماشایان کەم، چونکە ئەوانە زۆریان بە دەرزی و دەوای عەوەزی من مردوون. ئەوەیە کە دەڵێن :

کـۆلـکە مـەلا دیـن مـی‌بـرد     کـۆلکە دوکتور جـان می‌بَـرَد

سەعدی دەڵێ جارێک کابرایەک چاوی دێشا، چوو بۆ لای دکتوری کەران. دکتور ئەو دەرمانەی کە لە چاوی کەرەکانی دەکرد لە چاوی کرد، کابرا بە جارێکی کوێر بوو، برادەرێکی لێی پرسی ئەوە بۆ کوێر بووی ئەویش نەقڵەکەی بۆ گێڕایەوە. پێی گوت : جا ئەگەر تۆ کەر نەبوایەی نەدەچووی بۆ لای دوکتوری کەران. لەو بارەوە دەردی دڵی زۆرە بابەکەم، لە زۆر حاڵی بین بە قەولی مەلای کۆیی :

ئەوەی زانایە نـاو جـەرگی پەلاسـە     ئـەوەی نـادانـە نـازانـێ چ بـاسـە

بە ڕاستی هۆی دواکەوتنی کۆمەڵگا لە باری ماددی و مەعنەوییەوە ئەو کەسانەن کە خۆ بە زانا دەزانن بەڵام نەزانن.
هیوادارم خەڵک بە خۆ دا بێنەوە و کار و باری دین و دونیا بدەن بەو کەسانەی کە زانا و ماهیر و دڵسۆزن.
ئەمین دەڵێ :

تـا ئێـوە حـاڵو بـە بـاش نـەگۆڕن　　　　بە ڕواڵەت زیندوون ئەینا لە گۆڕن

بەڵێ :

خدە و خووی گەندەڵی کۆمەڵ گەلێکن　　　　گـەلی بـۆ تێـوەدان لـە دوای هـەلێکن
سۆران

# .: بەشی ٣١ :.

دەڵێن جارێک کابرایەک وشتری لێ ون دەبێ تەماشا دەکا ئەوە کوڕ و کچێک کە حەز لە یەکتر دەکەن لە کن یەک ڕاوەستاون و ڕاز و نیازی دڵداری لە یەک دەکەن، کوڕەکە ئەم شێعرانەی بۆ یارەکەی دەخوێندەوە :

مـــن کـە بـە مـەمـک بـەخـێو کـراوم　　　　چۆن هـەتـا مـاوم مـەم پـەرست نـابم
ئێـستاش بـۆ مـەمـک دەڵـێ منـاڵــم　　　　هـەر بـۆ بـاوەشـە، خـەون و خـەیاڵم
هەرچەند ئەم مەمکە لـەم مـەمکە جیایە　　　　چ بـکەم تـەمـەنـم لـەگـەڵ مـەمـایـە

دوایی کوڕەکە بە یارەکەی گوت : ئەگەر چاوم بە تۆ دەکەوێ نیوەی دنیام تێڕا دیارە، کابرا گوتی : بە قوربانت بم وشترم لێ ونبووە تەماشاکە داخوا دیار نییە.
کوڕەکە ڕوانی و گوتی خاڵە ئەو لا دونیایەی کە لێم دیارە لەوێدا نییە، حەتمەن لە لا دونیایەکەی دیدایە.
ئەی لاوی دڵدار دڵت تەنگ نەبێ، خەمبار مەبە، ئومێدت بە خوا بێت، بە یاری خوا بە دیدار و وەسڵی یارەکەت شاد دەبی و بە دەستەولەملان دەبنە بلاوێنی یەکتر؛ واتە دەبنە حەڵاڵ و خەمخۆری یەکتر. نامی دەڵێ :

بـەهار ڕووباران لـە کێـو دێنـە خـوار
پێچ لـە خـۆ دەدەن بە وێنەی ڕەشمار
واتـــە ڕووبـــاریـش دڵبـــرینـــدارە
دێـوانـــە و دەلـــوەی دیـــداری یـارە

ئاخ ئەو دڵبەرەی دڵی دەڵۆ کرد
دڵبیمارانی بێ گفتگۆ کرد
بۆ قەت جووت نەبوو لەگەڵ دڵداریێ
تیماری نەکرد دڵی زاماریێ
دیارە ئەیهەویێ عاشق بکوژێ
تا خاکی گوڵزار، خوێنی بمژێ
عاشقی داماو بەشی کوشتنە
دڵبەریش بەشی لە خوێن رشتنە
بەڵێ بە باس و تەزکاری یاران
چاوی موشتاقان دەڕژێنی باران
چەند خۆشەکە یار بۆ یاری گیانی
سینەی ببرژێ وەکوو بریانی
عاشقی داماو، خەوی حەرامە
خەوی بۆ چییە، یاری مەرامە
گرانتر لەوەش جەوری رەقیبان
ئەوجار ئیستیغنا و نازی حەبیبان
ئەو هەویێ دڵت کون کون بێ و زامار
بێ تەبیبی دەرد، بێ دەوای بیمار
خۆ نابێ لای کەس بڵێ زامارم
یا لای دوکتوران بڵێ بیمارم
نامە بنووسێ لەسەر پەڕەی گوڵ
بەچی، بە خوێناو، یانی خوێنی دڵ
بۆ لای کێ بۆ یار، نایخوێنێتەوە
تا زامەکەی من بکڵێنێتەوە
کە هاوارم کرد نابیسی دەنگم
کە ئازارم گرت نابینی رەنگم
ئەگەر ببینی تکەی خوێنی دڵ
ئەیکا بە نیشان تا دێتە مەنزڵ

وێنەی نێچیری زاماری کۆسار
بە خوێن بۆی دەچی تا پەنای موغار
بە نیوە گیانی باش سەری دەبڕی
بێ سووچ، بێ ئەسباب یەخەی دادڕی
هەمووم پێخۆشە بەو مەرجە یارم
لەدوا مردنم بێ بۆ مەزارم
لەسەر گۆڕەکەم دانیشێ تاوێ
تەماشام بکا بە گۆشەی چاوێ

# .: بەشی ٣٢ :.

لە مەلایەکیان پرسی دەهۆڵ و زوڕنا حەرامە؟ گوتی بۆ من حەرامە چونکە بە هەوای دەهۆڵ و زوڕنا دڵم لێدەدا و هەڵدەپەڕێ، دیارە حیساب لەسەر دڵ و دەروونە نەک لەسەر رواڵەت، بە قەولی مەولەوی :

ما درون را بنگریم و حال را        ما برون را ننگریم و قال را

جارێکیان کە تازە تەلەیفونمان وەرگرتبوو ژنێک تەلەفۆنی کرد گوتی : ئەمن حەز لە تۆ دەکەم، گوتم وەڵڵا یەکی توند و گورجت دیوەتەوە هەر بۆ ژوانان دەبم،بڕۆ یەکی ئازاتر وەبینە بە قامێ من خۆت هەڵوەدا مەکە.

ئەو کاتە زەمانی شۆڕشی مەلا مستەفا بوو. ئاوارەی عێراقی زۆر لێبوون، یاخوا شای خائین لەناو گۆڕیشدا نەحەسێتەوە و هاودەمی مار و دووپشک بێ کە خەیانەتی بە شۆڕشی مەلا مستەفا کرد و لەگەڵ سەددامی زاڵم کلکیان لێک بەست و دژ بە کوردان لە ئەلجەزایر رێک کەوتن. بەڵام خوای کوردان هەردووکی گرفتار و رۆژرەش کردن و بوون بەپەندی عالەم. یاخوا هەرکەس کە زاڵم و ملهوڕە بە دەردی وان بچێ و ببێتە نیشانەی تووک و نەفرینی مەزلوومان.

زاڵم و خوێن مژ حەمە و هەم سەددام        هەردوو ئەسیر بوون، ئەسیری سەد دام

***

خەم مەخۆ رۆژانی ماتەم وا بەرەو دوایی دەڕۆن
پایز و زستانی ماتیڕوو بە کۆتایی دەڕۆن
کامووس

# .: بەشی ۳۳ :.

دەڵێن پیرێژنێک جارێکیان مانگایەکەی لە کێوی نایەتەوە، دەچێ بۆ لای مەلای ئاوایی دەڵێ : مەلا مانگاکەم نەهاتۆتەوە، دەمی گورگم بۆ ببەستە. مەلاش دەڵێ بە چاوان، پیرێژن بە بێ خەمی لیی دەنوێ. بەیانی کە هەڵدەستێ و دەچێتە دەرێ لە ئاوایی تەماشا دەکا ئەوە گورگ مانگاکەیان شڕ و دڕ کردووە و خواردویانە. پیرێژن دەست دەکا بە چاپۆکە بەخۆدادان و دەچێ بۆ لای مەلا و بە سەریدا دەگوڕێنێ و دەڵێ مەلا یاڕەببی ئەو کیتەڵە ماستانەی کە بۆم دیناى بە سەرەتان و حەوتەلۆت بن، خۆ مانگاکەم گورگ خواردویەتی، خۆ تۆ بە لای نابەخێرت دەمی گورگت بۆ بەستبووم. مەلا دەڵێ وەڵڵا لیم تێکچوو، بە جێ ئەوەی دەمی گورگەکە ببەستم، دەمی مانگاکەم بەستووە.

دیارە ئەو کارەی مەلا لە دوو لاوە کەڵەک و عەوامفەریبی بووە، لە کوێی قورئاندا دوعای دەمی گورگی هەیە. بەسە ئەی مەلای نامەلا، هەتا کەنگێ لەپەنای دین عەوامفریوی دەکەی، ئەگەر خۆت بە مەلا دەزانی دین ناس و دونیا ناس بە و لە زلکاوی خوڕافات و نەزانی خۆت رزگار کە و چیدی خۆت و گەلەکەت بە هیلاکەت مەدە، لەگەڵ کاروانی رەوشەنبیری وعیلم وزانین برۆ پێشێ و دوا مەکەوە. ئەمن بۆ تۆمە لیم مەکە لۆمە، بە کوردی : حاڵی بوون لە پلاوی خۆشترە، دۆست ئەو دۆستەیە عەیب و عارەکانت بە دیاری بۆ بێنێ.

کوا قورئـان لـەبۆ دەمـی گورگییـە　　　دیارە ئەم قسـە، قسـەی هورگییـە

# .: بەشی ۳۴ :.

ئەو کاتە ماڵمان لە گرویس بوو، دەورانی منالی شەوێک پۆلێک منداڵ چوینە ماڵێک بۆ «پشکیلان». سوتفە کابرای خاوەن ماڵ لەماڵ نەبوو، ئەو ماڵەیەش گەورەکچیان هەبوو. کوڕێکی جحێڵیش هات بۆ ماڵی کابرا و گوتی منالینە وەرن پشکیلانێ بکەین، ئێمەش بەعەڵقە دانیشتین. کوڕە گەنجەکە شتێکی لەناو دەستی خۆی هاویشت و لە ناو کۆشی یەکێک لە ئێمە

دەیشاردەوە. کە دەستی بۆ نێو کۆشی ئێمە دێنا خێرایەک دەستی دەردێنایەوە، وەختێک کە گەورە بووم بیرم کردەوە لە نەگبەتی ئەو کوڕە جحێلە کە لە پەنای ئێمەی منالّ بە نێوی پشکێلان چ نەگبەتیەکی کردووە. دیارە داوێن‌پیسی و بێ‌ئەخلاقی کارێکی زۆر ناشیرن و دوور لە کەسایەتییە، کەوابوو ئەی گەنجەکان ریعایەتی ئەدەب و ئەخلاق بکەن و چاو لە داوێن پیسان مەکەن.

دەڵێن دوو نەفەر هەورامی یەکیان بە یەکی دەڵێ تۆ چویە گیان چەند ژنان، دەڵێ ئەمن یەک بە یەک دەیانڵێم، تۆش هەرچی گوتم دەنکێک تەسبیح باوێ بە زمانی خۆیان بە هاویشتن دەڵێن «تەقنە». کابرای داوێن‌پیس هەر ژنان هەڵدەدا و دەڵێ «تەقنە» لە ئاخریان بێ ئەوەی ناوێک بلێ دەڵێ «تەقنە»، دۆستەکەی دەڵێ کێیە ناوەکەی بلێ، دەڵێ ئەوەی ئاخریان کە وام لێکردووە خوشکتە، کابرا زۆری پێ ناخۆش دەبێ، دەڵێ منیش «تەقنە» دەڵێ ئەتۆ کێت وا لێکردووە، دەڵێ دایکت.

دیارە کەسێک لە دەرگای کەسێک بدا لە دەرگای دەدەنەوە، جا برای بەڕێز وەک تۆ پێت ناخۆشە خەڵک تەماع لە ئابڕو و ناموسی تۆ بکات، خەڵکیش ئاوای پێناخۆشە، پیاو بە و داوێن پیس مەبە، دایک و خوشکی خەڵک وەک دایک و خوشکی خۆت تەماشاکە، خەیانەت بە ناموسی کەس مەکە، تا خەڵکیش خەیانەت بە ئابڕوو و ناموسی تۆ نەکات، ئەگەر خوانەخواستە تا ئەمڕۆش وا بووی دەست بەردار بە و بە خۆتدا وەرەوە و پەڕێزت خاوێن کەوە.

# :. بەشی ٣٥ :.

دەڵێن جارێک کابرایەک چوو بۆ ماڵی رەفیقێکی کە تەماشای کرد خەریکی موتالەعەیە، سڵاوی کرد و گوتی وا دیارە لە وەختێکی باشدا هاتم، کەست لە لا نییە و وەڕەزی، گوتی تا تۆ نەهاتبووی زۆرم لە لا بوون بەڵام ئێستا هەر تۆم لەکنی.

دیارە دونیای موتالەعە دونیایەکی پان و بەرینە و خۆش و خاڵی لە مەراق و ژانەسەرە، باشترین هاودەم و رەفیقە. ئەمین زەکی بەگ دەڵێ : شەش ساڵان خەریکی نووسینەوەی کتێبێکی مێژوویی بووم، رۆژێکیان خەبەریان بۆ هێنام کە ماڵەکەت ئاگری گرتووە، دەڵێ منیش

لە دڵی خۆمدا تەنیا خەمی پەڕتووکەکەم بوو و هیچ خەمی کەل و پەلی ناو ماڵم نەبوو، کەچی بە داخەوە کتێبەکەم سووتا و بوو بە خۆراکی ئاگر.

دەڵێن کابرایەک بە زانایەکی گوت : فلان کتێبم بۆ بنێرە؛ کابرا گوتی : دەبێ بۆخۆت بێی بۆ خزمەت کتێبەکە. زۆر جوانە کەوابوو ئینسان نابێ کتێب بە پێل خەڵکەوە بەری بەڵکوو دەبێ خەڵک بە پێل کتێبەوە بچێت. بەداخەوە بازێک لە نووسەران بەزۆر کتێب بە خەڵک دەفرۆشن و بە پێلیانەوە دەبەن، بێگومان سووکایەتیە بە خۆیان و بە پەڕتووکەکە.

شێخ رەئووفی بێژرەیی بۆی گێڕاومەتەوە، گوتی : فلانکەس چەند ساڵێکیان بە کتێبێکەوە بووم، دوایی نەفەرێکی سەردەشتی گوتی ئەگەر رازی بێ ئەمن لەچاپی دەدەم بە خەرجی خۆم، گوتم : ماڵت ئاوا بێ زۆرم پێخۆشە، پەڕتووکەکەم تەحویلدا، دوای دوو مانگ هێنایەوە گوتی فلانکەس کتێبەکەم بردە لای فلان حاجی تەماشای کرد و چەند ئیرادێکی لێگرتوون لە بەر ئەوە لە چاپم نەداوە، گوتی منیش کتێبەکەم لێ وەرگرت و خستمە ناو کوورەوە، کابرا گوتی ئەی فلانکەس ئەوە بۆ واتکرد، گوتم کتێبێک بێ فلان حاجی بێسەواد و نەزان ئیرادی لێ بگرێ هەر بۆ سووتان چاکە.

بە داخەوە ئەوانەی نووسەرن کەمدەستن لەبەر ئەوە زۆرینەی بەرهەمەکانیان بوونە خۆراکی مشک و لەبەین چوون. دەوڵەمەندەکانیش قۆڵی هیمەت هەڵناکەن کە بەرهەمی نووسەران و شاعیران لە چاپ بدەن، بە هیوای ئەو رۆژە کە زانا «ئینشای» لەسەر بێ و دەوڵەمەند ئیفشا.

# .: بەشی ۳۶ :.

دەڵێن کابرایەک نوێژی دەکرد، پشیلەیەک دێتە پێش نوێژەکەی، کابرا گوتی دەنگی دەدەم نوێژەکەم دەبڕێ، ئەگەر دەنگی نادەم جێی سوجدەی لێگرتووم، گوتی وا باشە سوورەتێک بخوێنم کە وشەیەکی وەک «فسە»ی تێدابێ پشیلەکە بڕوا و نوێژەکەشم نەفەوتێ، گوتی «فُصِّلَتْ»، پشیلەکە دەرپەڕی.

دەڵێن کابرایەک ژنێکی زۆر خەراپی دەبێ، ژنە دەمرێ و لەکۆڵی دەبێتەوە، مەلا لەسەر قەبران دڵخۆشی کابرا دەداتەوە و دەڵێ خەمت نەبێ، لە قیامەتدا دەیدەنەوە بە خۆت. کابرا دەڵێ خەڵکینە بە شاهید بن، هەرسێک تەڵاقی قیامەتیشم کەوێ، ئەمن لە خۆشیان باوەڕ ناکەم

کەمردووە و لە کۆڵم بۆتەوە، مەلاش بە لای ئاخیری دەیهەوێ لە قیامەتیش بە کۆڵم داوەشێنێتەوە.

دەڵێن دوو ژن لە خانەقین سواری ماشێن دەبن بێن بۆ هەولێر، ئەوەندە گەرمی قسەکردن دەبن کە دەگەنە هەولێر هەموو موسافیرەکە دادەبەزن ئەوان نەبێ، رانەندەکە پێیان دەڵێ خوشکم گەیشتینە هەولێر، دانابەزن؟ یەکیان دەڵێ توخوا بە راستە؟ ئەی بۆ دەیانگوت هەولێر دوورە، خۆ ئێمە لە ئەوەڵی قسان داین.

دەڵێن کابرایەک ژنەکەی زۆر گەرۆک دەبێ، پێیانگوت فلانی خێزانەکەت زۆر دەگەڕێ، گوتی کوا وایە؟ ئەگەر گەڕۆک بوایە رۆژێک تووشی لە ماڵی خۆمان دەکەوت. بێگومان گەڕانی زۆر بۆ ژن بە بێکار باش نییە.

دەڵێن لە حوشتریان پرسی ئەرێ ملت بۆ خوارە، گوتی جا کوێم راستە هەتا ملم راستبێ. بە داخەوە ئینسانی خوار و ناڕاست لەناو جەماوەردا زۆرن، خۆزگە جەماوەر لە ئینسانی خەراپ و بە قوڕت و پێچ خاوێن دەبۆوە، ئەو کاتە دونیا دەبێ بە بەهەشت، دەڵێن هێڵی خوار لەژێر سەری گای بنەوەیە، شاعیری فارس دەڵێ :

پای دیوار چون نهد معمار کج　　　تا ثریا میرود دیوار کج

دەڵێن ئەو هەویرە ئاوێ زۆر هەڵدەگرێ.

# .: بەشی ٣٧ :.

باوکی خوالێخۆشبووم دەیگوت : جارێک ژنێکی فارس هاتە دووکان، گوتی حاجی ئەم تەشتە بە چەندی؟ منیش گوتم بە سەد تمەن. گوتی : حاجی زۆرە، کمتر حساب کن، دەڵێ گوتم خانم کمتر نمی‌برم، ژنەکەش بە قسەکەم خەندەیەکی هاتێ و گوتی : کمتر ببر، بە کورتی هەر ئەو دەیگوت کمتر ببر، ئەمنیش دەمگوت کمتر نمی‌برم.

جارێک باوکم ناردمی بۆ کن حاجیەک بۆ دە هەزار تمەن کە ئەو وەختەیە یەکجار زۆر بوو. کاتێک چوومە ماڵی حاجی گوتی : رۆڵە راست دەکەن دەڵێن بابت بۆتە بارەبەر؟! جا لە مامت کەوێ، تۆ پووتی لێنێ و بۆخۆشت لە نێو بارێ سوار بە و لە هەورازیش لێی دامەبەزە.

باوکم بۆی گێڕامەوە گوتی کە ماڵمان لە گروێس بووە زۆر فەقیر بووم، شەوێکیان میوانمان زۆر هاتبوون، نوێن و بانیشمان نەبوون، تەنیا جاجمەیەکی گەورە نەبێ. شەوێ وەختی

خەوێ یەک باوەشم دار هێنان، سۆبەکەم نێڵ نێڵ دا، میوانەکان لە گەرمان ئارەقیان کرد، لەو کاتەدا گوتم : نوێنان بێنن، میوانەکان گوتیان کوڕە بۆ خاتری خوا سووتاین لە گەرمان، هیچمان ناوێ. گوتم : باشە هەر جاجمەکە بێنن بەسە، دوایی سۆبەکە کوژایەوە و هەتا بەیانی میوان لەسەرمان هەڵچۆقیبوون.

بەڵێ فەقیری ئاوایە، تووشی هەموو شتێکت دەکا، بە قەولی شاعیر :

آنـچه شیـران را کنـد روبـه مـزاج احتیاج است، احتیاج است، احتیـاج

دایکی خوالێخۆشبووم بۆی گێڕامەوە گوتی : سالێکیان ئێوە منداڵ بوون، لەگەڵ خۆم دەمبردن بۆ دیدەنی ماڵی بابم. لە نیوەی ڕێ تووشمان لە ئاغای ئاوەدانی کەوت، گوتی خوشکە حەلیم چەند نەفەرن؟ گوتم قوربان بە کەرەکەوە حەوتین، کەوام گوت زۆر پێکەنی و گوتی ئافەرانم بۆ حازر جوابی و قسەی خۆشت.

دیارە ئەوانە هەموو ڕۆیشتوون و نەماون و لە شاری خامۆشان لە ناو نوێن و بانی گڵ لێی خەوتوون. ئێمەش هەر دەمرین، گرنگ ئەوەیە بە عیززەتەوە بژین و بە عیززەتەوە بمرین، وا نەمرین لە دوا مردن تووک و نەفرینمان لێبکەن.

چنان زی که ذکرت به تحسین کنند چو مردی نه بر گورت نفرین کنند

سعدی

# .: بەشی ٣٨ :.

دەڵێن دنیا بە خەمان پێکنایە، کەوابوو ئینسان تا بۆی بکرێ لەکار و باری ژیاندا غەم و پەژارە نەخوا، بەڵکوو بەجێی ئەوە مشوور لە کار و باری بخوا کە چۆن کار و بارەکانی بچەرخێنێ و بۆ هەر کارێک ئەسباب و وەسیلە بەکار بێنێ و لە باری خۆیەوەبۆی بچێ. گوتمان دەرد و خەفەت دەردێک دەرمان ناکەن، هەروەها لەگەڵ ئەو کەسانەی کە سەر دەرچوون مەشوەرەت و ڕاوێژ بکە بۆ هەر کارێکی گرنگ.

کەوابوو کاکە گیان ئەمن بۆ تۆمە، وجوودی خۆت بە خەفەت و خەم لەبەین مەبە و خۆت تووشی خەمدەردان مەکە و دوژمنان بە خۆت خۆش و دۆستان خەفەتبار مەکە. دەڵێن قسەی خۆش لە بەهەشتەوە هاتووە و باوەشێنی دڵانە. بۆ نموونە جارجار کە وەڕەزی ڕووی تێدەکردم،

عوسمان پیرۆتی کە دەستە برای ئازادی کورمە، دەیگوت فلانکەس خەمان مەخۆ، دونیا بە خەمان پێکنایە، دەست بە جێ بە قسەکەی وەرەزیم دەشکا وەک برینێک کە زاخاوی دەکەی ساڕێژ دەبێ، وەک گوڵ دەگەشامەوە. جا تۆش برا بەڕێزەکەم کە وەڕەز بووی، ئەم شێعرانە وەخوێنە و بیانکە بە باوەشێنی دڵی خەمبارت :

| | |
|---|---|
| عەزیزم خەم مەخۆ تـا مـاوی تـاوێ | ژین بـێ بەقایـە و دەڕوا بـە تـاوێ |
| بە خەم، خەم نەبی تا هەی لە هەردان | بـەرەو یـار بـڕۆ نەوەسـتی تـاوێ |
| بـە یـارت بـڵێ : لـە مـەی مـەیدانێ | بـە پیـاڵـەی بـلوور بۆمن مەیدانێ |
| هـەتـا بینـۆشـم بـە یـادی یـاران | سەرخۆش و بێخەم دیمە مەیـدانێ |
| دەخیـلـە نـەڕوا بـە فیـڕۆ دەمـت | بـە وشـەی شیرین پاراو بێ دەمت |
| نەبی بە چـەقڵ بـۆ فـەرد و کۆمـەڵ | بـە فیدای گەل بێ، سامان و دەمت |
| چیـای ئـەدەبـت چیـای مـەڕوانـە | سا بە چاوی کەم لە خۆت مەڕوانە |
| قـەدرت دەزانـن بـە واتـە مـەردان | دیـارە ئـەمینیش هـەر لەمەڕ وانـە |

# .: بەشی ٣٩ :.

دەڵێن جارێک رەسووی نادری تووشی لە هەورازێک کەوت، نەیدەزانی چۆن لەم هەورازە سەر کەوێ. گوتی سوتفە لەم کاتەدا مەلایەک هات، گوتم کارێکی وادەکەم ئەو مەلایە لە کۆڵێم کات. گوتم : مەلا حەیرانێکت بۆ دەڵێم لەو هەورازە لە کۆڵێم کە. گوتی : نا ئەمن حەیرانێکت بۆ دەڵێم ئەتۆ لە کۆڵێم کە. ئەمنیش لە دڵی خۆمدا گوتم مەلا حەیران نازانێ، زوو لێی دەبڕێ و نۆبەی من دێتەوە. بەڵێ مەلا هاتە کۆڵم و دەستی پێکرد بە حەیران و هەر دەیگوت : لێ لێ، بە کورتی هەوراز تەواو بوو و مامۆستا هەر دەیگوت : لێ لێ. گوتم مەلا هەوراز تەواو بوو، ئەوە کەنگێ نۆبەی من دێ، گوتی قوڕت بە سەری ئێستا نەگەیشتوومە لۆلۆ، ئەویش بەشی دوو هەورازان دەبێ.

جارێک بەهار چووبووین بۆ گەشت و سەیران، پۆلێک برادەر دانیشتبوون، هەر ئەوەندەم دی رەحمان دڵدار بەرەو ئێمە دەهات. قیافەی گرتبوو یانی ئەمن هونەرمەندم و ئەوە هیچ نازانن، گوتم کورینە ئێستا رەحمان دڵداری دەبەزێنم، بە کورتی لە بەند و شێعرانم گرت، گوتم:

بەهار و گولزار شیفای ئازاران جیلوەگای ئالای بالای نازداران
نیشاتن بۆ رووح، شادین لەبۆ دڵ مایەی رزگارین بۆ نەوای بولبوول
گولزار بۆنی خۆش دەدا بە شەماڵ شەماڵ دەیگێڕێ و دەیبا ماڵ بە ماڵ
بەرەبەیانان دەماخی یاران پڕ دەبێ لە بۆی خۆشبۆی گولزاران
بەهار بە جلوەی گولزاری رەنگین دەڕازێتەوە بە لالە و نەسرین
دەبێ بە بەهەشت سارا و دەرودەشت یارانیش دەبن بە حۆری بەهەشت

خولاسە رەحمان دڵدارم بەزاند، کەوابوو هەر شتێک بۆ رۆژی خۆی بەکار دێت و فریات دەکەوێ.

بە کابرایەکیان گوت : ئەتۆ چ پێویستیت بە زۆڕنا زانینە، گوتی بیزانم باشترە با ئەگەر چوومە نێو لۆتیان نەڵێن زۆڕنا لێدان نازانێ و خۆم بەسەردا هەڵکێشن.

# .: بەشی ٤٠ :.

شەوێکیان لە نیوەشەودا خێزانم دەستیکرد بە ناڵەناڵ و گریان. گوتی : ئەمین هەستە یاسینم لەسەر بخوێنە دەمرم. هەروەها وەسیەتی کرد گوتی لە قەبرستانی شێخەسوورم بنێژن. گوتم ئافرەت کوڕە ماڵم لە گای نەنێی، گوتی تازە کارم تەواوە. بەیانی لە نەڕەوگوڕە و بەزم و هەڵای وی وەخەبەر هاتم، خێرا هەستام و چوومە دەرێ تەماشام کرد ئەوا بەزمی بە کابرایەک گرتووە کە بارە داری بۆ هێنابووین. دەیگوت کەمت دار لێناوە، ئەمنیش گوتم ئەرێ ئافرەت ئەتۆ شەوێ نەتگوت دەمرم، ئێستا ئەم بەزمە چییە بەو کابرا فەقیرەت گرتووە.

جارێک ناسکەی کچم کە منداڵ دەبێ لەگەڵ کچی جیرانەکەمان دەمەتەقەیان لێ پەیدا دەبێ. کچی جیرانەکەمان دەڵێ : ئێمە ماشینمان هەیە و ئێوە نیتانە. ناسکەش دەڵێ : جا ئێوە قۆڕازە شکاوێکتان هەیە بەڵام ئێمە مانگایەکی بەڵەکی گەورەمان هەیە، هۆڕە هۆڕەکەی دەگاتە گردە سوور. چارەنووس ئەو کچە جیرانەمان کە ناوی گەلاوێژە، بوو بە خێزانی مەهدی کوڕم.

جارێکیان هادی کوڕم درەنگ هاتەوە، نان خورابوو، سفرە چێشتاوی و بێلەزەت بوو، هادی قەڵس بوو گوتی : ئەو گەند و گەڵاشە چییە لەسەر سفرەکەیە، ئازادی کوڕم گوتی کاک هادی ناڕەحەت مەبە راستە دەڵێن :

تا نخوری گند و بو هرگز نگیری رنگ و رو

دیارە وا باشە ئینسان لە خواردندا بۆزووت و تەبیعەت کشمیشی نەبێ، چونکە ئەگەر نان و چای بەقیز و بیزەوە خوارد تووشی نەخۆشی دەبێ.
سالی ١٣٥٠ی هەتاوی باوکم ژنی بۆ هێنام، کاتێک کە بووک هات، ئەمن لە مزگەوت خەریکی موتالەعە بووم. بووک لە سوێی شارمان دەگری و دەڵێ : دەبێ زاوا بە پیلمەوە بێت و شتێکم لە قەبەڵبکات. هاتن بەدوومدا گوتیان ئەرێ ئەوە تۆ لە کوێی، ئەوە بووکمان بۆ هێناوی لە سوێی شار مانی گرتووە، بە زۆر وەپێش خۆیاندام، «پوور نەدەترێ بە زۆریان دەتراند»، بەهەر حاڵ چووم گوتم ئەوە هەموو دەشتی کەڵوێم لە قەبەڵکردی، ئەوجا بووک مانی شکاند.

# .: بەشی ٤١ :.

مەولانای رۆمی بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ رۆژێک مەلایەک و سەییدێک و سۆفیەک بەسەر یەکەوە دەچن بۆ نێو باخێک، سوتفە باخەوان لەوێ نابێ. مەلا و سەیید و سۆفی بێ پرس‌وڕا دەست دەکەن بە میوە خواردن. زۆری پێ ناچێ باخەوان دێتەوە کە تەماشا دەکات ئەو سێیە کە خۆیان بە پەپوولەی خوا دەزانن بە بێ ئیجازە هاتوونە نێو باخ و دەستیان کردووە بە میوە خواردن. دەڵێ : واباشە تەنبێیان بکەم ئەمما ئەوان سێ نەفەرن و ئەمن یەک؛ واباشە لێکیان بکەم ئەوجار یەک یەک پێیان دەوێرم، خولاسە چۆ لایان و سڵاوی لێکردن و بەخێراتنێکی گەرم و گوڕی لێکردن. دوایی رووی لە سۆفی کرد و گوتی مام سۆفی هەرچەند بە کاری تۆش ناشێ بەڵام زەحمەت نەبێ لەجیاتی من بچۆ لە ماڵێ راخەرێک بێنە هەتا لەسەری دانیشین. سۆفی وەڕێکەوت، باخەوان رووی لە مامۆستا و سەیید کرد و گوتی : مامۆستا ئەتۆ جێنشینی پێغەمبەرانی؛ جێی رێز و حورمەتی؛ هەروەها سەییدیش ئەولادی رەسوولە و جێی رێز و قەدرە بەڵام ئەو سۆفیە جاهیل و نەزانە چ کارەیە؟ وەڵڵا ئەگەر ئیجازەتان لەسەر بێ دەچم تەنبێی دەکەم. گوتیان : فەرموو؛ باخەوان کەوتە سەر سەیید و گوتی مام سۆفی راوەستە. سۆفی راوەستا و باخەوان پێی گوت وەرە بزانم شێخ عەبدولقادری گەیلانی یان شاهی نەقشبەندی بە تۆیان گوت کە دزی حەڵاڵە. گوتی : وەڵڵا کەس گوتی کەوایە ئێستا عیلاجت دەکەم، وەریگەڕایە بە پێمەڕان زۆر چاکی کوتا. گوتی برۆ جارێکی کە نەتبینمەوە؛ ئەوجا هاتەوە بۆکن مەلا و سەییدان گوتی : ئاغا سەیید لە جیاتی من بچۆ لە ماڵێ نان و پێخۆرێک بێنە، ئەمن لە خزمەت مامۆستادا دەبم؛ سەید گوتی : باشە. کە ڕێکەوت باخەوان رووی کردە مەلا و پێی

گوت: مامۆستا ئەتۆ داعی دین و پێشەوای خەڵکی، قەدر و ڕێزت لەسەر چاوانە و دەبێ بە کۆڵێ میوەت بۆ بێنم بەڵام سەیید چ کارەیە خۆی نێو ناوەتە ئەولادی ڕەسووڵ و کۆڵێکی شاڵ لە خۆ بەستووە، وەڵڵا ئەگەر ئیجازەت لەسەربێ دەچم دەستێکی دەگەیەنمێ؛ گوتی : فەرموو. باخەوان خێرا کەوتە سەر سەیید و گوتی سەیید ڕاوەستە. سەیید ڕاوەستا؛ باخەوان پێی گوت ئەرێ بزانم کێ بە تۆی گوت دزی حەڵاڵە؟ پێغەمبەر بە تۆی گوت یان حەزرەتی عەلی؟ گوتی: وەڵڵا کەس. باخەوان وەریگەڕایە بە کوتکان شل و پلی کوتا، گوتی : بڕۆ؛ جارێکیتر بە بێ ئیجازە نەیەوە نێو باخی. سەیید گوتی : تۆبە. ئەوجا باخەوان هاتەوە لای مەلا گوتی : مەلا پێم بڵێ ئاخۆ ئیمامی شافیعی بە تۆی گوت دزی حەڵاڵە؟ لە چ کتێبێکی شەرعیدا هەیە کە دزی حەڵاڵە؟ مەلا گوتی : باخەوان حەق بە تۆیە، ئەوە شانی من و داری تۆ، باخەوان دوو پێمەڕەی شکاندن واتە لە سەیید و سۆفی پتر لێدان خوارد.

دیارە ئەگەر ئەوانە بە قسەی باخەوان پشتی یەکتریان بەرنەدایە و لەگەڵ یەکتر، بوونایە باخەوان نەیدەتوانی ئەوانە لێک بکا و یەک یەک دارکاریان بکا، هەروەها مەلا و سەیید و سۆفی دەبێ ئوسوەی حەسەنە و سەرمەشق بن بۆ جامیعە و خەڵک لە ئاکار و ڕەفتاریان ئامۆژگاری وەربگرن، بەداخەوە زۆر کەس بە نێوی دین و لە پەنا دین ئەنواعی فرت و فێڵ و عەوام فریوی دەکەن، بە قەولی مەلا غەفوور :

گەلێ کەس لە ژێر ڕیش و عـەباوە　　　خـەریکی فێـڵ و کەڵـەک و داوە

# .: بەشی ٤٢ :.

دەڵێن مەلایەک دەچێتە لای کورتاندروێک. مەلا دەست لە کاری کورتاندروەکە وەر دەدا و دەڵێ : دەی ئاوا پووشی تێهاوێ و ئاوا تەقەڵی لێدە. کورتاندروش دەڵێ : مەلا قسەی لە کاری پیاواندا مەکە، ئەوە کورتاندرونە و فیش و فاڵ، مەلایەتی نییە و قیل و قاڵ.

بە ڕاستی وایە و هەرکەس لە کاری خۆیدا وەستایە.

دەڵێن کابرایەک ئافتاوەکەی کوون بوو، کە دەچوو بۆ ئاودەست لە پێشەوە دەستی بە ئاو دەگەیاند ئەوجا قەزای حاجەتی دەکرد.

دەڵێن کابرایەک کە دەستی بە ئاو دەگەیاند ئەو دووعایەی دەخوێند: «اَللّٰهُمَّ أَرِحْنِي رَائِحَةَ الْجَنَّة»، کابرایەک گوێی لێبوو گوتی خاڵە ئەو دووعایە دوعای کونی خوارێ نییە، بەڵکوو دوعای کونی لووتە.

مەبەست ئەوەیە هەر شتێک لە جێی خۆیدا نەبێ غەڵەتە.

دەڵێن جارێک ئاغایەکی زۆر بەڕێز بە دووکانداریکی گوت: مام حاجی خوا بازارتدا، گوتی : بۆ خوت مامی، ئاغا گوتی راست دەکەی مام بۆ تۆ نابێ بۆ مام جەلال دەبێ.

دیارە زۆر کەس لە پیاو و لە ژن بە مام و پوور قەڵسن، یەعنی بە پیربوون رازی نین. سەعدی دەڵێ : رۆژێک چاوم بە پیرێژنێک کەوت سەر و پرچی رەش کردبۆوە، گوتم دایە پیرێ ئەوە سەرەکەشت بە درۆ و دەرمانان رەش کردەوە، ئەدی چ لە پشتە کۆمەکەت دەکەی؟

کەوابێ ئینسان واباشە بە پوور و مام و خاڵ قەڵس نەبێ، پیریش بۆ خۆی دەورانێکە لە ژیان، چ لەوە خۆشتر مرۆڤ تەمەن درێژ و پیری ئاخر خێر بێ، کەوابوو دەورانی پیری بە چاکی و باشی جێی شانازییە، هەر چەند مرۆڤ کە پیر بوو غەریب دەبێ و یادی دەورانی گەنجی دەکاتەوە، هەروەک شاعیر لەو بارەوە دەڵێ :

جوتیارێکی پیر لە دەشت دەیناڵان ... دەیگوت ئاخ پیری جوانیت کرد تاڵان
تـۆوی دەوەشـانـد، دەیـلاوانـدەوە ... بـۆ کـاتی لاوی و تـەواناى سـاڵان

دەڵێن لە باسکردنی ئەشخاس و ئەحزاب و گرۆ و دەستەجاتدا دەبێ ریعایەتی ئەدەب و عیففەتی کەلام بکرێت.

بەداخەوە هێندێک کەس هەن کە نێوی کەسێک یان گرووهێک دێنن و وشەی ناحەز و جنێو بەکار دێنن کە ئەوە لەگەڵ ئەخلاق و ئەدەب نایەتەوە.

## .: بەشی ٤٣ :.

دەڵێن پیرێژنێک دەبێ لە دێیەک هەمەکارە دەبێ؛ واتە مامانی و نێوکهێنانەوە و چەند کارێکی کەش بۆ خەڵکی ئاوایی دەکات و قەت بێکار نابێ، رۆژێکیان دەڵێ وا دیارە ئەمڕۆ بێکارم ، دەست دەکا بە مەشکە ژاندن.

چەند خۆشە شپلە و گەرمی مەشکەڕەش
باوەشینەکەی شەماڵ و بارەش
چەند سارد و سۆلە دۆی مەشکە نێری
بە لەنجە و لارە دەیژێنێ بێری

بەڵێ لەناکاو بانگیان کرد هۆی پوورە فاتێ، وەرە فلان ژن بە منداڵیەوەیە، پوورە فات قەڵس بوو گوتی هەر ڕۆژە لە ماڵێک بانگم دەکەن، ئەدی کەنگێ لە مەشکۆلەکەی خۆم بژێنم.
برادەرێک گوتی فلانکەس فلان نەقلی وەنووسە و فلان نەقلی مەنووسەوە، ئەمنیش گوتم با نەقلێکت بۆ وەگێڕم. دەڵێن کابرایەک چوو بۆ لای خاڵکووبێک؛ گوتی : رەسمی شێرێکم لە پشتی بۆ وەکێشە. خاڵکووب بە دەرزیەوە تێڕاچوو، کابرا زۆری هێشا، گوتی : ئەوە کوێی شێرەکەیە؟ گوتی : گوێیی؛ گوتی : با گوێی نەبن. گوتی باشە؛ ئەوجا تێڕاچۆوە، کابرا زۆری هێشا. گوتی : وەستا ئەوە کوێی شێرەکەیە؟ گوتی : کلکیەتی؛ گوتی : با کلکیشی نەبێ. خولاسە بەو چەشنە هەر گوتی با ئەویش نەبێ، خاڵکوب قەڵس بوو؛ دەرزیەکەی فرێدا و گوتی : شێرێک بێ گوێی نەبێ، فلانی نەبێ بۆ چی دەبێ؟ با هەر نەبێ.
دیارە ئەگەر نووسەریش بە ئارەزووی خەڵک شت وەنووسێ هیچی بۆ نامێنێتەوە و دەم لە پووش دەبێ.

# :. بەشی ٤٤ .:

دەڵێن جارێک شێر چاوی بە پشیلێک کەوت، پێی گوت تۆ لە نژادی ئێمەی بەڵام بۆ وا لەڕ و چکۆلەی؟ گوتی جانەوەرێک هەن پێیان دەڵێن ئینسان، هێندەیان زوڵم و ستەم لێکردووم هەتا ئاوام لێ بەسەر هاتووە. شێر گوتی : قبوڵ ناکەم، لە کوێن هەتا تۆڵەی تۆیان لێوەکەم. پشیلە وە پێش کەوت، لە رێگا تووشی فیل و حوشتر بوون گوتی ناکا ئەوانە ئینسان بن، گوتی نا ئەوانەش بە دەست ئینسانەوە زەلیلن. لە دواییدا گەیشتنە لێرەوارێک، کابرایەک لەوێ داری دەکردنەوە، پشیلە گوتی ئەی شێر، ئەوەیە ئینسان. شێر بە کابرای گوت ئەوە بۆ چەند ساڵە زوڵم لە پشیلە دەکەن، مەگەر نازانن ئەوانە لە نژادی ئێمەن و ئێمەش پاشای جانەوەرانین، زوڵم لە کەس قبوڵ ناکەین. شێر لێی ڕاسا و گوڕاندی، کابرا گوتی ئەی شێر ئاوا نابێ دەبێ ئەمنیش بچم ئەسلەحەی خۆم بێنم، شێر گوتی باشە، بڕۆ بیهێنە، کابرا گوتی ئاخر تا دێمەوە دەڕۆی

دەبێ وەتبەستم، شێر گوتی باشە لێت بێمنەتم. کابرا شێری بە گوریس و قایەسان بە قەدە دارێکەوە توند بەستەوە و فرزەی لێ بڕی، ئەوجار بە بیوران و بە تەرکان دەستی کرد بە کوتان و لێدانی. شێر بە پشیلەی گوت ئەرێ زۆرم ماوە بە قەت تۆم لێبێتەوە؟ پشیلەش دەیگوت قوڕت بەسەری ئێستا لە کوێتە. مەبەستی شێر ئەوە بوو ئەگەر بەقەت پشیلەکەی لێبێتەوە لەدەست کابرا رزگاری دەبێ. دیارە بە پێی سروشت، ئینسان لە هەموو گیانلەبەرێک زرینگترە، خۆ ئەگەر ئەم کابرایە زرینگی خۆی فریای نەکەوتبایە بە یەقین شێرەکە بە هیلاکی دەبرد، ئەگەر شێرەکەش مەغروور نەبوایە دەیتوانی ئەو کابرایە غافڵگیر کا و دایهێنێ و هەلاهەلای کات.

لەم نەقڵەدا بۆمان دەرکەوت کە زرینگی و چالاکی لە هێز و شان و بازوو باشترە، بە قەولی سەعدی : «روز میدان اسب لاغرمیان بکار آید نه گاو پرواری.»

# .: بەشی ٤٥ :.

جارێک بە سەفەر چوومە گەهوارە. شەوێ لە ماڵی ئاشنایەک میوان بووم، بە بۆنەی منەوە کابرای خانەخوێ سەیید تەیموری شاعیری دەعوەت کرد کە خەڵکی وێ بوو. زۆر شاعیرێکی بەرز و بەڕێز بوو. جەماعەتێکی زۆرمان لەدەور بوون. شەو نشینیەکی زۆر خۆشمان هەبوو. لەگەڵ سەیید تەیمور کردمان بە شەوی شێعر؛ ئەمن بە لەهجەی سۆرانی و ئەویش بە لەهجەی کەڵهوڕی، جەماعەتیش بە گەشە و نەشە ببوونە گوێڕایەڵ. دیارە دونیای شێعر و شاعیری زۆر خۆشە، چونکە شێعر ئاوێتەی سۆز و خەیاڵ و هەڵقوڵیوی دڵە و هەتوانی زامی دەروونە.

دەڵێن لە بێژوێ کابرایەکی زۆر نەقڵباز هەبوو دەگێڕیتەوە دەڵێ : جارێک چوومە دێیەک کە تەماشام کرد مەولوودیان هەبوو، مەلاشیان نەبوو. منیش پێچێکی سپیم لەسەر بوو کە وە ژوور کەوتم گوتیان ئەوە شوکر مەلاشمان بۆ هات و مەولوودییەکەمان بۆ دەخوێنێتەوە. بەڵێ خۆ منیش هیچم نەدەزانی، بۆم دەست پێکردن بە قلی و بلی کە تەماشام کرد لەسەربان کوڕ و کاڵان کردیان بە شایی و هەڵپەڕین. دەڵێ مەولوودیەکەم بەجێهێشت چوومە سەربانی لەوێ بوومە چاوش و دەستم کرد بە گۆرانی گوتن.

# .: بەشی ٤٦ :.

ساڵێکیان لە گروێس منداڵ بووین، لەگەڵ چەند منداڵێکی ئاوایی لە قەراغ دێ گاڵتەمان دەکردن. تەماشامانکرد پیرێژنێک بە نێوی فاتمە فەقێ لە بێژوێڕا هاتبوو.بارێکی کیتەڵە و گۆزەڵە پێبوون. ئەو فەقیرە هێواش‌هێواش کەرەکەی لێدەخوڕی هەتا کیتەڵە و گۆزەکانی لێنەشکێن، ئێمەش بە نەگبەتی لەبن بەردێکی گەورە خۆمان شاردەوە، کە گەیشتە ڕاست ئێمە لە پڕ دەرپەڕین و بە دەنگێکی بەرز گوتمان «پەپ». گوێدرێژەکە دەرپەڕی و هەڵات، تەواوی کیتەڵە و گۆزەڵەی پیرێژنێ ورد و هاڕ بوون. پیرێژن دەستی بە تووک و دووعایان لێمانکرد و بۆمان هات، ئێمەش هەڵاتین، بە ڕاستی کارەکەمان کارێکی زۆر خەراپ و نەگبەتی بوو.

داوا دەکەم لە منداڵان خۆ لە نەگبەتی بپارێزن، عاقڵ و بە تەربیەت بن، بۆ ئەوەی کاتێک کە گەورە بوون و ویژدانیان ناڕەحەت نەبێ وەکوو ئێمە.

کابرایەک هەتا تووشم دەبوو دەیگوت ئەرێ فلانکەس دەوڵەمەندی خۆشە؟ جارێک نا و دەجار نا! ڕۆژێک لە پێش ئەوەدا ئەو قسە بکا گوتم ئەمڕۆ من پرسیارێکم لەتۆ هەیە، گوتی دەی، گوتم ئەرێ گوو خواردن خۆشە، خوات حەسێنێتەوە ئێستا و ئێستاش نەیگوت ئەرێ دەوڵەمەندی خۆشە.

ئەگەر ئەو کابرایە هێندەی ئەو پرسیارە بێجێیەی نەکردبایە تووشی ئەو قسەی نەدەبوو.

دەڵێن کتێب وەک میوانداری وایە. بۆ میسال میوانداری شاییە. هەڕەمەی خەڵک دەبێ دەعوەت بکەی. لەگەڵ ئێوا دادەنیشی کە ئەو بە تۆ قەڵسە و تۆش بەوی قەڵسی. میوانداریەکی دیشمان هەیە کە تایبەتی و دۆستانەیە. دەچی ئەو کەسانەی کە بابەتن دەعوەتیان دەکەی، واتە کتێبیش هەر بەو شێوە دوو جۆرن. کتێبێک بۆ هەڕەمەی خەڵک دەبێ و بابەتە و دەیکڕن و دەیخوێننەوە، وەکوو ئەم پەڕتووکە، بەشەکەی تریش بۆ دەستەیەکی تایبەتی دەبێ، وەک دیاری بۆ هۆگرانی قوڕئان کە ئەو عەینی واقعییەتە.

لە عومرمدا جارێک لەگەڵ کابرایەکی پیر تووشی شەڕ بووم. ئەو تەورداسی پێبوو ئەمنیش بیور. لێکڕاساین، ئەمن لەوی دەترسام و ئەویش لەمن، کابرا تۆزێک ڕاوەستا و فکری کردەوە گوتی ئەمن پیر و ئەو جوان، ئەمن تەورداسم پێیە و ئەو تەور. گوتی : کاکە ئەمن شەڕ ناکەم، گوتم ماڵت ئاوا بێ منیش شەڕ ناکەم.

دیارە ئینسان تا بۆی بکرێ خۆی تووشی شەڕ نەکا، بەرهەمی شەڕ هەر شەڕە.
مـاری دیمی بـاشترە ئـامـان لە ئینسانی بـەشەڕ
گەر بەشەر ئاوا بەشەڕ بێ، تف لە ملوێنێ بەشەر

بۆ ئەوەڵین جار کە رادوێ لە گروێس پەیدا بوو شەوانە تەواوی منداڵی ئاوایی لەو ماڵە کۆ دەبوینەوە. کاتێک کابرای خاوەن رادوێ(ناسراو بە کەریمی ئەحمەدی)، رادوێکەی بۆ هەڵدەکردین لە خۆشیان دەبوو بە چەپلەرێزان، کابرایەکی پیریش جارجار بەڵێی بۆ رادوێکە دەگوت و سەری بۆ رادەوەشاند. ئەوە ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی بوو.

بەڵێ کاکەگیان دەورانی منداڵی ئێمە خەڵک فەقیر بوو ئەو شتانەی ئەمڕۆ هەن، ئەودەم هیچیان نەبوون؛ بە کورتی ئەمڕۆ دونیا بەهەشتە لەچاو ئەو زەمانەی. دیارە رۆژ بە رۆژ دونیا خۆشتر دەبێ. دەڵێن کابرایەکی پیرگوتوویەتی بریا نەنکم ئێستا لەسەر گوێلکان گاڵتەی بکردایە... .

# .: بەشی ٤٧ :.

دەڵێن کابرایەکی کورد میوانی کابرایەکی توورک دەبێ. شەوێ کوردە زوو خەوی هات، تورکە گوتی : «یەترەڵی» واتە خەوت دێ؟ کوردە گوتی یەترەڵی دەڵێم یەترەڵی بزانم یەترەڵی چییە. تورکە گوتی یەترەڵی؟ کوردە گوتی یەترەڵی خێرا جێی بۆ راخست و کوردە لەسەر پشتی لێی راکشاو گوتی ئۆخەی «یەترەڵی» چەندە خۆشە، ئەگەر دەمزانی هەر ئێوارێ دەمگوت «یەترەڵی.»

واباشە ئینسان کە میوانی بوو، زوو خوڵقی خەوی بکات، ئیدی وا نەبێ زەنگیانانی پێ بووەنێ.

دەڵێن کابرایەکی کورد چوو سەر دووکانی تورکێک، دەیهەویست زەردەچێوەی بکڕێ، گوتی زەردەچەپیولێت هەیە؟ تورکە قەڵس بوو گوتی جنێوَان دەدەی چەپیوڵی بۆ خۆتی.

بەڵێ ئینسان کە زمانان نەزانێ تووشی ئەو بەزمانەش دەبێ. کەوابوو گەنجەکان چاو لە ئێمە مەکەن، خۆتان فێری چەند زمانێک بکەن و گۆی خۆتان لە مەیدان بەرنەوە. جارێک لە تاران لەگەڵ برادەرێک دەگەڕاین، تووشمان لە مەیدانی «حوڕ» کەوت، کابرا گوتی ئەوە

مەیدانی «خرە» ئەو بۆرەی کە لەسەر حیێیەک بوو بە نوختەی زانیبوو. ئەوەیە دەڵێن : قول و فول لێک ناکاتەوە یا دەڵێن : هەڕێ لە بڕێ ناکاتەوە.

# .: بەشی ٤٨ :.

دەڵێن کابرایەکی مەڕدار لەسەر دارێک دەبێ، گێژەڵووکەیەکی توندی لێ هەڵدەکات، خەریک دەبێ بەروەبێ دەڵێ خوایە ئەم گێژەڵووکەم لەکۆڵ وەکەی هەموو خوری ئەم ساڵ دەدەم بە فەقیر و هەژاران. گێژەڵووکەکە هێواش دەبێتەوە، دێتە خوار لەسەر قەدی دارەکە دووبارە گێژەڵووکەی لێ هەڵدەکاتەوە. دەڵێ : خوایە ئەم جارەش گێژەڵووکەم لەکۆڵ وەکەی کەشکی ئەمساڵ دەدەم بە فەقیر و هەژاران. ئەم جارەش خەلاسی بوو، کە هاتە خوار فکری کردەوە کەشک و خوری ئەمساڵەی زۆر دەکات، پەشیمان بۆوە و لەبەر خۆیەوە دەیگوت : کەشکی چی و پەشمی چی.

دیارە ئینسان کە شتێکی لە خۆ گرت نابێ پەشیمان وەبێ، ئەمە کارێکی پیاوانە نییە چونکە بەدقەولی زۆر عەیب و عارە. دەڵێن بەرهاویشتنی پیاوان وەعدە بە درۆ دەرچوونە ئەوەیە کە شاعیر گوتوویەتی :

| | |
|---|---|
| دو سوراخ است در ترکیب انسان | که می‌آید صدا از هر دو بیرون |
| خلاف قول خود کردی تو بی شک | صدا از کاف و از واواست و از نون |

دەڵێن کابرایەک لەناو چۆمدا کەوتە ناو گێژاوێکەوە خەریک بوو بخنکێ، گوتی خوایە کەرتێکم ژن و منداڵ هەن، رزگارم کە لەم کڵ وگێژانە. کابرا بە سەلامەت پەڕیەوە، گوتی خوایە خۆ ئێستا ژنیشم نەهێناوە.

دەبێ بڵێین کەسێک ئەهلی فرت و فێڵ بێ رۆژێک دەکەوێتە گیر و هەر بە داو و تەڵەی فرت و فێڵان لە بەین دەچێ، عارەب دەڵێ : «اَلحَاوِی لَا یَنجُو من الحیات» واتە مارگر لەدەست مار رزگاری نابێ و رۆژێک هەر پێوەی دەدات. دەڵێن خودا دیرگیرە بەلام سەختگیرە. هەروەها دەڵێن : کەسێک چاڵێ بۆ خەڵک هەڵکەنێ بۆ خۆی تێدەکەوێ یان دەڵێن : پیاو هەر سینگی ناخوا سینگیش دەکوتێ، کەوابوو خۆش بە حاڵی ئەو کەسانە کە راست و بێ فرت و فێڵن لەگەڵ خوا و خەڵک.

# .: بەشی ٤٩ :.

کابرایەک دەیگوت ئینسان شێتی دونیا بێ باشترە نەک شێتی قیامەت.

پیاوچاکێک دەڵێ : ئەتۆ دونیایە بگرە بەڵام مەهێڵە دونیا ئوتۆ بگرێ، بۆ ئەتۆ دەتوانی دونیا بەردەی بەڵام دونیا ئەتۆ بەرنادات.

(دونیا وەکوو تاوە و بە تاوێ تێدەپەڕێ          دەخیلە نەکەی بە تاوێ خۆ نەفرۆشی)

زیان می‌کنـد مـردی تفسـیر دان          کـه علـم و ادب میفروشـد بـه نـان
سعدی

جارێکیان دەروێشێکی سیگاری هاتە دووکان لەبەر بۆ خلتەی دڵم پڕ بوو، خوا خوام بوو بڕواتە دەرێ. گوتی : ئەرێ فلانکەس سێزدەبەدەر شەرعییە یا نا، گوتم دەروێش بێ شەرعی زۆرن بۆ هەر لە سێزدەبەدەر دەپرسی؟ گوتی وەک چی؟ گوتم بۆ نازانی ئەو سیگارە کێشانەی تۆ بێ شەرعییە و ئەزییەت و ئازاری خەڵکی تێدایە، برۆ سیگارەکەت تەرک کە و ئەوجا لە بێ شەرعی بوون یا نەبوونی سێزدەبەدەر پرسە. بۆیە دەڵێن : کابرایەک حوسێنی کوشتبوو دەیگوت دەبێ گووکێچ نوێژی پێوە بێ، مانگا قوونی دڕابوو بەڵمەیان تێداخنی، گاڕانی ئاواییان رادا بە زۆری تازە دەپرسێ لە مانگا بۆری، کابرا گاسنی لە چاوی خۆیدا نەدەدی، پووشکەی لە چاوی خەڵکدا دەدی. بەهەر حاڵ کاری خەراپ و تاوان زۆرن بەڵام ئەوانەێ کە ئەزیەت و ئازاری خەڵکیان تێدایە خەرابترن وەک سیگارکێشان.

# .: بەشی ٥٠ :.

دەڵێن مەلایەک حەدیسی دەخوێندەوە : گوتی هەر کەس دەتمەنی بکا بە خێر خوا سەد تمەنی دەداتەوە. کابرایەک کە ئەوەی گوێ لێدەبێ دەڵێ : مەعامەلە لەوە باشتر نابێ، دەتمەنی هەبوو چوو دای بە فەقیرێک. دوای ئەوە هەر چاوەڕوان بوو داخوا کەنگێ سەد تمەنی بۆ دێنێتەوە. رۆژێک دەچێ بۆ سەحرا، لەبن دارێک دادەنیشێ لەنەکاو عەرەبێکی سەیر وەک شێتان

بەرەو کابرا دێت. کابرا لە ترسانی خێرا دەچێتە سەر دارەکە و خۆی مات دەکا، عەڕەبە چاوی لێنابێ و لەبن دارەکە دادەنیشێ، خورجینێکی پێدەبێ لێکی دەداتەوە و تۆپەڵە قوڕێکی لێ دەردێنێ و سێ هەیکەلانی لێ درووست دەکا و بە ڕەدیف دایان دەنێ. روو لە هەیکەلی ئەووەڵ دەکا و دەڵێ ئەی ئادەم خوا لە بەهەشتدا ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی دایەی و لە هەموو نیعمەتێکی ئازادی کردی تەنیا لە داری گەنم نەبێ، بۆ ئەوت خوارد ولە نازی بەهەشت خۆت بێ بەش کرد و وە دەریان نای؟ وەڵڵاهی دەبێ شمشێرێکت لە گەردنێ دەم. رووی لە هەیکەلی دووەم کرد و گوتی : ئەی شەیتان ئەی تۆ بۆ بە قسەی خوات نەکرد و سوجدەت نەبرد و خۆت لە ڕەحمەتی خوا بەری کرد، وەڵڵا تۆش دەبێ بکوژرێی و لە گەردن بدرێی. ئەوجا نۆبەی هەیکەلی سێهەم هات، گوتی : ئەی خوایە ئەتۆش وادیارە هەر لە بەهانە بووی، لە ئادەم و شەیتان وەڵڵاهی شمشێرێک لە گەردنی تۆش دەدەم. کابرای سەردار هاواری کرد گوتی کوڕە مەیکوژە سەت تمەنی منی لەسەرە! کابرای عەڕەب لە ترسان هەڵات و خورجێن و مورجینی بە جێهێشتن. کابرا هاتە خوارێ، تەماشای خورجینەکەی کرد سەد تمەنی تێدا بوو کە گەڕایەوە تووشی مەلا بوو گوتی مەلا حەدیسەکەت دروست بوو بەڵام کە فریا خۆم نەکەوتمایە خەریک بوو خوای بکوژن و سەد تمەنی منیش بفەوتێ.

دەڵێن کە خوای دای هێلێک بەسە، گۆیا دەڵێن کابرایەک جووتی دەکرد لە خەتە جووتێکدا بەسەر چەند کووپە خەزەنەدا دەکەوێت.

دەڵێن هەڵۆ تەمەنی کەمە و زوو پیر دەبێ بەڵام قەلەڕەشە تەمەنی زۆرە، گۆیا چل ساڵی هەر بارە و هەزار ساڵی تەمەنە. هەڵۆ دەچێتە لای قەل و دەڵێ ئێوە بە چی ئاوا تەمەن درێژن. پێم خۆشە ئێمەش ئاوا تەمەن درێژ بین.قەل دەڵێ ئەگەر پێت خۆشە وەک من تەمەن درێژ بی، چوار مەرجت بۆ دادەنێم. هەڵۆ گوتی : فەرموو. قالۆ گوتی : یەک، بە جێی ئەوەی کە لە جێی بەرز و بڵند هەڵنیشی دەبێ لە خڕ و دۆڵاندا لەسەر گەندەڵە داران هەڵنیشی. دوو، دەبێ بە جێی ئەوەی کە گۆشتی تازە و خاوێن بخۆی دەبێ گۆشتی مندار و لاکەتۆپیوان بخۆی. سێ، دەبێ بە جێی ئەوەی کە ئاوی سارد و زوڵاڵ لە کوێستانان وەخۆی دەبێ ئاوی گەرم و بۆگەنی زێراب و فازیلاوان وەخۆی. چوار، دەبێ بە جێی ئەوەی کە لە هۆبە و هەواران بۆن و بەرامی گوڵ و گوڵزاران هەڵمژی، دەبێ بۆنی پەین و پاڵ و چەقڵ و چاڵان هەڵمژی. جا کە ئاوا بکەی ئەوە تەمەنت درێژ دەبێ. هەڵۆ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی : ئەی قەلی ڕووڕەش بۆ ئەتۆ بە هۆی ئەو شتە پیسانەوە ئاوا تەمەندرێژی؟ دەبڕۆ، ئەو ژیانە بێ عیززەت و بێ شەڕەفانە هەر بۆخۆت بێ. ئەمن ژیانە کەمەکەی خۆم بە هەزاران ژیان و ژیواری وەک تۆ نادەم کە بە شەڕەفەوە دەژیم.

ئەوەی گوت و دای لە شەقەی باڵ بەرەو کوێستان و هۆبە و هەوار و چیا بەرزەکان. دیارە ئەم نەقڵە پڕ لە پەند و ئامۆژگارییە.

# .: بەشی ٥١ :.

دەڵێن جارێک لە ماشێنێکدا کوڕێکی گەنجی تێدا دەبێ کە سەر و پرچێکی سەیر و درێژی دەبێ و کراسێکی سوور و شەڵوارێکی زۆر تەنگی لەبەر دەبێ، لەگەڵ ئەوەش هەنیە و ئارایشی کردبوو. کابرایەک پێی دەڵێ : کیژۆڵێ زەحمەت نەبێ تۆزێک بڕۆ بەو لاوە. قەڵس دەبی و دەڵێ بۆ سووکایەتی بە من دەکەی، وەڵڵا ریشت سپی نەبوایە لە دمم دەدای. کابرا دەڵێ ئەرێ خەلکینە ئەمە لە ژن دەچێ یان لە پیاو، هەموو یەک دەنگ دەڵێن وەڵڵا ئەمە قەت لە پیاو ناچێ، ئێمەش هەر بە کچمان زانیوە.

بە داخەوە ئەمڕۆ بازێک لە جەوانەکان لاسای لاوەکیان دەکەنەوە و لیباسی رەسەن و جوانی کوردەواریان وەلاناوە.

جارێک لە شارێک بووم هەر پێیان دەگوتم : خەلیفە، منیش گوتم بۆ پێم دەڵێن خەلیفە؟ گوتیان لەم شارەدا هەرکەس لیباسی کوردی لەبەر بن پێی دەڵێن خەلیفە. گوتم بەداخەوە، ئەوە بە هەڵەداچوون، ئەمە لیباسی خەلیفان نییە و لیباسی کۆن و رەسەنی باب و باپیرانمانە.

دەڵێن جارێک شێخی جامی لە سەحرایەک دەکەوێتە فکری خەلقی ئەم بوونەوەرە و ئەم شێعرە لەبەر خۆیەوە دەڵێ :

بسکی در جانی فگار و چشم بیدارم تویی   هر که بیدار می‌شود از دور پنـدارم تـویی

پیاوێکی بێبڕوا کە گوێی لێدەبێ، دەیهەوێ جامی بەسەهوو بەرێ. پێی دەڵێ ئەگەر ئێستا کەرێک پەیدا ببێ پنداری چییە؟ گوتی : پندارم تۆی.

جارێک کە عاشوورا دەبێ کابرایەک بە زۆر دێنن بۆ نێو عەلقەی شین و شەپۆر و دەڵێن دەبێ تۆش لە خۆت دەی، ئەویش لەبەر خۆیەوە دەڵێ :

نە از دل است، نە از جان   از کتک است حسین جان

دیارە هەر کارێک کە بە زۆر بە کەسێک بکرێ بە کار نایەت، ئەوەیە دەڵێن : کەچەڵ بە زۆر لە داری هەڵناڕوانێ.

مریشک بۆ خۆی خۆڵ وەسەر خۆی نەکا، بە هەموو عالەم ناتوانن خۆڵی وەسەر کەن.

دەڵێن ئاغایەک بە زۆر نوێژی بە کابرایەک دەکرد، کابرا دەڵێ : نیەتمە دەکەم ئەو نوێژە فەرزە بۆ ئاغا.

کەوابوو ئینسان هەر کارێک بکا دەبێ بە مەیل و رەغبەتی خۆی بێ نەک بە زۆرە ملێ.

# .: بەشی ۵۲ :.

مەلایەک دەیگوت دوو ساڵان لە دێیەک مەلا بووم کە کتێبم لێک دەکردەوە حەدیسیان بۆوەخوێنم کابرایەکی زۆربلێیان هەبوو دەیگوت : مامۆستا جارێ شەکری خۆت لەزاری دابێ... ، بە کورتی ئەو دوو ساڵانە لەبەر کابرای زۆربلێ نۆبە حەدیسم نەهات.

جارێک لە سلێمانی لەگەڵ میرزا رەحمانی برام لە ماڵێک دەعوەت بووین. مامە شوانەی گەلاش کە شاعیرێکی زۆر بەرزە، لەوێبوو. کاک رەحمان دەستیکرد بە قسان. نۆبە قسەی کەسی نەدەدا، وەکوو بولبول دەیخوێند. ئەمن لە دڵی خۆمدا زۆرم بەزەیی بە خۆم داهات کە کاک رەحمان هێندە زانایە. کە لێبۆوە مامە شوانە گوتی کاک رەحمان سەد ئەوەندەش زانا بێ، بە قورئانی لێم خوێندووە بەقەت حاجی مەلام خۆشناوێ. کەوایگوت، ئەمن هەڵبڕامەوە.
کەوابوو ئینسان نابێ خۆی پێ هیچ بێ، بەڵکو دەبێ خۆی بەکەم نەزانێ و لە باری ماددی و مەعنەوییەوە ئەگەر بەش و باریش کەمبێ، رازی بێ.

دەڵێن ئیمامی حەنەفی بە منداڵێکی گوت : رۆڵە ئاگات لەخۆ بێ نەکەوی، منداڵە گوتی : بەڕێزم ئەمن بشکەوم قەی ناکات، ئەتۆ ئاگات لەخۆ بێ نەکەوی چۆن پێشەوای خەڵکێکی.

سەعدی دەڵێ : پیاوچاکێک میوانی ماڵی پاشا دەبێ، شەوێ کە دەچێتەوە بۆ ماڵ بە خێزانەکەی دەڵێ : نانم بۆ بێنە برسیمە. منداڵەکەی پێی دەڵێ : بۆ مەگەر ئەتۆ میوانی پاشا نەبووی؟ گوتی رۆڵە کەمم نانخوارد هەتا پاشا بڵێ پیاوی چاکە، منداڵەکەی پێیگوت کە وایە نوێژەکەشت قەزا بکەوە چونکە ئەویشت بەڕیایی و لەبەر پاشا بووە.

جارێک قسەم بۆ پۆلێک منداڵ دەکرد، منداڵەکان قاقا پێم پێدەکەنین، یەکێک لە منداڵەکان گوتی : خاڵە بۆ تۆ جوان نییە قسە بۆ منداڵان بکەی.

جارێک خێزانم دۆڵمەی «بەلەچەکان»ی لێنابوون. مەهدی کوڕم کە منداڵ بوو گوتی دایە ئەوە چێشتی گۆرەویانت لێناوە. کابرایەکمان میوان بوو گوتی : هەی بە بابەوەت دەبەر مرم، بەخوا چاکت هەڵێنا.

# .: بەشی ٥٣ :.

جارێک لەگەڵ برادەرێکی زۆربڵێ دەچووم بۆ تاران. کە سواربووین دەستی کرد بە قسان، هەتا توانیم «بەڵێ»م بۆ گوت. دوایی خەوم لێکەوت، کاتێک کە وەخەبەر هاتم تەماشام کرد گەیشتووینە کەرەج و کابراش هەر قسان دەکا.

دیارە زۆر بڵەیی قەباحەتە، دەڵێن زۆربڵەیی پیاوی نەزان وەکوو تەنەکەت بۆ بوکێ وایە؛ چونکە هیچ ناوەرۆک و دەقیکیان نییە، بەس ژانەسەر نەبێ هیچت پێ نامێنێ؛ بەڵام ئینسانی زانا هەرچی قسان زۆر بکا هێشتا هەر کەمە چونکە هەمووی دەرس و ئامۆژگارییە. زانایەک دەڵێ کە لە مەجلیسی هەرەمەی خەڵک دانیشتی بێدەنگی باشترە لە قسە کردن، چونکە دەبێتە کای بەر با و تۆزی هەوا و هۆی ژانەسەری خۆت، بەڵام کاتێک کە چەند نەفەرێکی تایبەتی و گوێڕایەڵ لە دەورەت کۆ بوونەوە. ئەوە ئەو کاتە قسە کردن باشترە لە بێدەنگی، بە قەولی سەعدی :

مجـال سخـن تـا نبـینی ز پیش　　　به بیهوده گفتن مبر قدر خویش

دەڵێن جارێک لوقمانی حەکیم ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد دەیگوت : رۆڵە گیان خوای گەورە دڵان بە هۆی عیلم و زانیاریەوە زیندوو دەکاتەوە هەروەک چۆن زەوی بە هۆی باڕانەوە زەنوێر و زیندوو دەکاتەوە.

زانایەک دەڵێ : نۆ شت لەگەڵ نۆ شت جوان و بە کەڵکن :

١- سیاسەت لەگەڵ عەدالەت

٢- عیززەت لەگەڵ ویژدان

٣- پوول لەگەڵ کار

٤- ناوبانگ لەگەڵ ئەرزش و کەرامەت

٥- تیجارەت لەگەڵ ئەخلاق و ئەدەب

٦- عیلم لەگەڵ ئینسانیەت و عەمەل

٧- عیبادەت لەگەڵ فیداکاری

٨- ماددی لەگەڵ مەعنەوی

٩- قودرەت لەگەڵ دادوەری

بێگومان لەنێو ئەوانەدا عیلم و زانیاری لە سەرووی هەمووی ئەوانەیە، چونکە عیلم هۆی رزگاری و سەربەستی و سەرکەوتن و پێشکەوتنی فەرد وکۆمەڵە :

زانست چرایە و چرای رزگاری    هەر گەلێ نەیبێ کراوە کاری
ئەو چرایەی هەرگیز ناکوژێتەوە    بێ ئەو هیچ گەلێ نابووژێتەوە

دەڵێن کابرایەک بە لای کەشاوەرزێکدا رۆیی، تەماشای کرد ئەوا خەریکی بژارکردنی چەقڵ و چاڵ و درک و گیاکەڵەی ناو بێستانە تا دێبەر و بێستانەکەی خاوێن بێ. گوتم : خۆزگە جەماوەریش ئاوا لە ئینسانی بەد و بێئەخلاق و شەڕانی بژار بکرایە هەتا جامیعەیەکی پاک و خاوێن و هێدی و هێمن بەدی هاتبایە و کۆمەڵگا بە گشتی وەک یەک بنەماڵە و چەند خوشک و برایەک بە سەرێکەوە بە خۆشی و تەبایی و برادەری و بەرابەری بیانگوزەراندایە. بەڵام بەداخەوە زۆرێک لە زانایان و دڵسۆزان و بەشەرویستان بەو ئاواتەوە چوونە ژێر خاک، هەر وەکوو مەلای کۆیی لەو بارەوە دەڵێ :

ئەوەی زانایە ناو جەرگی پەڵاسە    ئەوەی نادانە نازانێ چ باسە
هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم    عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم

# .: بەشی ٥٤ :.

مەولانای روومی دەگێڕێتەوە دەڵێ : جارێک سێ نەفەر کە یەکیان جوولەکە و یەکیان مەسیحی و یەکیان موسڵمان دەبن لەگەڵ یەک دەبن بە هاوڕێ. شەوێک لە ماڵێک میوان دەبن، رێکەوت هەڵوایان دەبێ، جوولەکە و مەسیحیەکە دەڵێن هەڵواکە هەڵدەگرین بۆ بەیانی ئێستا تێرین. موسڵمانە دەڵێ کاکە بەشی دەکەین، ئەمن برسیمە بەشی خۆم ئێستا دەخۆم. دەڵێن نەخێر هەر هەڵیدەگرین بۆ بەیانی. کابرای موسڵمان دەڵێ بۆ ئەوەی نەڵێن رەفیقێکی ناموافیقی باشە با قسەی ئێوە بێ و هەڵیدەگرین بۆ بەیانی و بە برسیایەتی سەردەنێتەوە. بەیانی کە لە خەو هەڵدەستن جوولەکە و مەسیحیەکە دەڵێن : وەرن با خەونی ئەمشۆ بۆ یەکتر وەگێڕین. خەونی هەرکەس خۆشتر بوو بەشە هەڵوای ئەوانەی تریش بخوا، جوولەکە دەس پێدەکا دەڵێ : ئەمن ئەوشۆ چوومە سەر کێوی توور، بە خزمەت حەزرەتی مووسا گەیشتم، زیارەتم کرد و دوعای بەخێری بۆ کردم. گوتیان بەهبەهبەهبەخوا خەونەکەت خۆشە، مەسیحیەکەش دەستی پێکرد گوتی ئەمشۆ منیش چوومە خزمەت حەزرەتی عیسا، تا بەیانی لەخزمەتیدا لە ئاسمانەکان سووڕاینەوە

و شتی زۆر عەجیب و غەریبم چاو پێکەوت. گوتیان بەهبەه لەو خەونە خۆشە! موسڵمانەش گوتی منیش ئەوشۆ لە خزمەت حەزرەتی محەممەددا بووم و زیارەتم کرد، گوتی رۆڵە ئەوە جوولەکە لەسەر کێوی توور لە خزمەت مووسا دایە و مەسیحیەکەش لە ئاسمانان لە خزمەت عیسا دایە، ئەتۆش هەر لە جێوە ئەو هەڵوایە بخۆ و دەنگی مەکە. گوتیان ئاکا هەڵوایەکەت خواردبێ؟! گوتی : بەڵێ خواردوومە، دەکرێ بە قسەی پێغەمبەرەکەم نەکەم؟! گوتیان تۆ لە ئێمە زرینگتر بووی ئەو بەزمە هەمووی لەبەر هەڵواکە بوو.

لەم نەقڵەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئینسان دەبێ فریوی کەڵەک و داوی فێڵبازان نەخوا و زرینگ و وریا بێ. من بەش بە حاڵی خۆم کەوتوومە داو و تەڵەی فێڵبازان، جارێک کابرایەک هاتە دوکان و گوتی «گیا سالمە»ی دەکڕم. گوتم : وەڵڵا نازانم گیا سالمە چییە؟! ئەویش دەستی لە گیرفان نا و لوێچێکی سەلکە گیا دەرهێنا و گوتی ئەمە گیاسالمەیە، ئەگەر لێت هەڵکەوت بۆم بکڕە، کیلۆی سی هەزار تمەنت دەدەمێ. گوتم : باشە با نموونەکەم لەلا بێ. کابرا رۆیی، زۆری پێ نەچووبوو یەکێتر هات گوتی خاڵە گیاسەلمێ ناکڕی، گوتم با، بەچەندی؟ گوتی بیست و پێنج هەزار تمەن. خێرا وەزنم کرد، بیست کیلۆ بوو، نەغد پارەکەم دایە، خۆشی خۆشی کیلۆی پێنج هەزار تمەن خێرێ دەکات. نموونەم هەڵگرت و چوومە لای دووکاندارێک کە کار و مەعامەلەی گیاسالمەی دەکرد. گوتم : گیاسالمەی دەکڕی؟ گوتی بەڵێ، تەماشای نموونەکەی کرد و گوتی خۆ ئەوە گیاسالمە نییە، گوتم چۆن؟!گوتی چۆن و مۆنی ناوێ، ئەوە کوڵاویان لەسەر ناوی تەزویرە. ئەوجا زانیم کە ئەو دوانە پێکەوە هاوکار و ساختەچی بوون. لە زەرەدەکەش ناخۆشتر ئەوە بوو برادەران شۆخیان پێدەکردم و دەیانگوت : فلانکەس گیاسالمەی ناکڕی بەڵام دوای ساڵێک بە گرتم دان و تۆڵەی خۆم لێکردنەوە و بۆ هەموو عالەمم تەمبێ کردن، بە قەولی شاعیر دەڵێ :

چـو بـد کردی مشو ایمن از آفات      کـه واجب شد طبیعت را مـکافات

دەڵێن دەعبای زرینگ بە دندووک پێوەدەبێ.

# :. بەشی ٥٥ :.

دەڵێن دوو نەفەر چوونە لای مەلا بۆ شەرع کردن. یەکیان گای بۆ مەلا برد، یەکیشیان تەنەکە رۆنی بۆ بردبوو. کاتێک مەلا شەرعی کردن، شەرعەکەی وەلای کابرای گا دا. کابرای

تەنەکە رۆنی گوتی وانابێ، دەبێ مەلای ئاگادار کەمەوە، گوتی : مامۆستا شاقەلەکەت چەورە، مەلاش گوتی گا پێی لێناوە.

دیارە یەکجاریش هەر وانەبووە بەڵام دەڵێن هەرچی نەبووە نەیانگوتووە، مەلای بێچارە لە هیچ زەمانێکدا ژیانیان دابین نەبووە، ئەو مەلایەش لەبەر فەقیریان تووشی ئەم بەزمانە بووە.

دەڵێن موفتی زەهاوی رۆژێک زۆر نارەحەت دەبێ، فەقێکانی لێی دەپرسن قوربان ئەمڕۆ بۆ وا نارەحەتی، ئەویش دەڵێ لە برسان، بە شێعر دەڵێ :

«جَعَلْتُ قَوْلِی شَرْحًا لحَالِی فاحذف اللام تَفْهَمْ سُؤَالِی.»

دەڵێن رۆژێک موفتی زەهاوی لە مەجلیسی داوود پاشا دەبێ، پێکەوە هەنیشک وەسەر سەرین دەدەن، پاشا دەست دەکا بە غەیبەتی کوردان. دەڵێ موفتی فەرقی کەر و کورد چییە؟! موفتیش دەڵێ ئەو سەرینەیە. پاشا بە خۆدا دەشکێتەوە، نازانێ کە موفتی کوردە و وەک خۆی لێنەهاتەوە.

دەڵێن جارێک موفتی تەماشای کرد کابرایەکی عەرەب گوێدرێژێکی لە پێشەوەیە دەڵێ : «إلی اَیْنَ یا اَبا الحمار؟!» عەرەبیش لە جەوابدا دەڵێ : «اِلَی السُّوقِ یا ولدی» واتە بۆ کوێ دەچی باوکی کەرێ، دەڵێ : دەڵێ دەچم بۆ بازاڕی ئەی کوڕم. موفتی دەڵێ بۆم دەرکەوت کە ئینسان نابێ شۆخیان لەگەڵ هەموو کەس بکات چونکە مرۆڤی وا هەیە شۆخی هەڵگر نییە و جەوابێکی زۆر رەقت دەداتەوە، دیارە «اب» لە زمانی عەرەبیدا بە خاوەنیش هاتووە.

## .: بەشی ٥٦ :.

دەڵێن کابرایەکی ئاشەوان تەماشای کرد کەللە سەرێک بە جۆگەی ئاوی ئاش دادەهات، دەیگوت خوایە خراپترم بەسەر نەهێنی، ئاشەوان گوتی بۆ لەوەش خراپتر هەیە؟ لە ناکاوکەللەسەر کەوتە بەر پەڕی ئاش و ورد و هاڕ بوو و هەر پرینچکەی چوو بۆ لایەک، ئاشەوان گوتی لەوەش خراپتر ئەوە بوو.

کەوابوو ئینسان کاتێک بەڵایەکی بەسەرهات نابێ بڵێ : دەبێ لەوەش گەورەتر هەبێ، نابێ دونیا لەخۆی وەتەنگ بێنێ بەڵکو دەبێ رووحی بەهێز بێ و نائومێد نەبێ، دەڵێن تەنگانان بەرینیان کورتە. هەروەها دەڵێن زیندان قەبری زیندوانە، کەوابوو دونیا لە خۆتان مەکەن بە زیندان و مەبن بە رەفیقی دێوەزمەی خەمان.

سەعدی دەڵێ : جارێک لە کەللەسەرێکیان پرسی تۆ لە دونیا چکارە بووی؟! بە زمانی حاڵ گوتی من یەکێک لە گەورەپاشایانی ئێران بووم، هێز و سەروەتێکی زۆرم هەبوو لەگەڵ ئەوەش هەوڵ و تەقەلام دەدا بۆ ئەوەی زۆرتر وەدەس بێنم، لەشکر و هێزێکی زۆرم سازکرد کە بچم وڵاتی «کرمان» بگرم بەڵام نەگەیشتم «کرمان» بگرم، مردم و لەناو گۆڕدا کرمان سەریان خواردم.

طمع کرده بودم که کرمان خورم  که ناگه بخوردن کرمان سرم

برو اندرونی به دست آر پاک  شکم پر نخواهد شد الا به خاک

هەروەها سەعدی دەگێڕێتەوە : میوانی کابرایەکی دەوڵەمەند بووم کە زۆر بە تەمەن بوو. گوتم ئایا لە دەوڵەمەندیدا تەواو تێر و تەسەل بووی؟! گوتی سەعدی مەعامەلەیەکی بچووکم ماوە، ئەوی دەکەم و دادەنیشم، ئەویش ئەوەیە : پارچەی یەمەن دەبەم بۆ عێراق، کاڵای عێراق دێنم بۆ ئێران و کاڵای ئێران دەبەم بۆ هیندوستان و ... خولاسە لێکیهاڵاند، ئەوەی ئەو دەیگوت لانیکەم بیست ساڵی دەویست، گوتم : «چشم جهاندار را یا قناعت پر کند یا خاک گور»، واتە ئینسان دونیا لەقەدەر خۆی و لە قەدەر حاڵ و پێویست لە باوەش بگرێ. دەڵێن ماڵ بۆ ژینە نەک ژین بۆ ماڵ. دەڵێن قەناعەت گەنجێکە کە قەت تەواو نابێ بەڵام قەناعەت نەک بەو مەعنایەیە کە ئینسان هیچ ناکا و تەمبەڵ و تەوەزەل دانیشێ، بەڵکو دەبێ هەوڵ و تێکۆشان هەبێ بۆ ژیانی خۆشتر و باشتر. هەروەها ئەی ئەو کەسەی سەورووەت و قودرەتت هەیە بە ماڵ و دەسەڵاتت خزمەت بە خۆت و گەل و نیشتمان بکە بێوچان و نەسرەوتن هەتا لە دوا مردنت خەڵک درووود و سڵاوت بۆ بنێرن و ببی بە چاولێکەری بۆ وەچەی داهاتوو.

# .: بەشی ٥٧ :.

لە کوردەواریدا عادەت وابووە لە کۆنەوە گەنجەکان لە پێشەوە سڵاویان لە پیران دەکرد؛ بەڵام ئێستا بە داخەوە جەوانەکان سڵاو وەپێش پیرەکان ناخەن، ناچار دەبێ پیرەکان لە ئەووەڵەوە سڵاو لە جەوانەکان بکەن. زۆرجار بۆ تاقیکردنەوە سڵاوم لە گەنجەکان نەدەکردووە؛ گوتوومە داخوا سڵاوم لێدەکەن کەچی بەداخەوە سڵاویان نەکردووە یان ئێوا هەیە دەڵێ دەبێ هەر خەڵک سڵاوی لەمن بکەن. بەڵێ، سڵاوکردن زۆر کارێکی باشە و خۆشەویستن زیاد دەکات.

واباشە ئینسان ریعایەتی گەورە و بچووکی بکا و خۆی بپارێزێ لە گاڵتە پێکردن بە خەڵک، ئیحتیرام بۆ بە ساڵاچووان عادەتێکی جوان و پەسەندی کوردەوارییە بەڵام بەداخەوە ئێستا زۆر کەم بووە و گەورە و بچووکی نەماوە، وەک کابرا بە شۆخی گوتی : برا بەخوا لەم زەمانەدا گەورە و بچووک نەماوە مەگەر لە نەعل و قۆنەرەدا نەبێ !!!

بە راستی هەر کەس کارێکیَ لێدەوەشێتەوە، کابرای پیر دەبێ ئەدەب و ویقاری زیاتر بێ و لە کاری خەراپ دوورەپەرێزی زیاتر بکات، ئەوەیە کە دەڵێن : «عشق پیری گر بجنبد سر بە رسوایی زند.»

هەروەها زۆر کار هەن لە شانی گەنجانە و لە وان جوانتر دەوەشێتەوە. دەڵێن لە قرژاڵیان پرسی بۆ بە دوو سەر دەڕۆی، گوتی جەواانان هەموو شتێکیان لێ جوانە. دیارە کاری خەراپ و ناحەز لە ئینسانی گەنجیش هەر ناحەزە بەڵام لە پیران ناحەزترە. بە هیوای بەدیهاتنی کۆمەڵگەی رازاوە بە ئەخلاقی جوان و پەسەند.

# .: بەشی ٥٨ :.

دەڵێن لە گوندێک کوڕێکی نەگبەت و زیانەخرۆی لێدەبێ کە نێوی «سوور حرووس» دەبێ، شەوانە دەچێتە گیان ماڵان.خەڵکی ئاوایی شکوا لە بابی دەکەن، ئەوجا بابی بە ناچار شەوانە دەیبەستێتەوە. شەوێک حرووس بەرهەڵدا دەبێ، بابەکەی دەچێتە سەربان و بە دەنگێکی بڵند هاوار دەکا : خەڵکینە هەرکەس ئاگاداری خۆی بێ سوور حرووس بەرهەڵدا بووە.

بێگومان ئەو کوڕە ئەگەر بە منداڵی تەربیەت کرابایە ئاوا نەگبەت و سەرەڕۆ نەدەبوو، ئەوەیە کە دەڵێن : «خووی شیری هەتا پیری» یا دەڵێن : شوو کە بە تەڕی دانەیێ بە وشکی دانایەت.

دەڵێن جارێک کوڕێکیان لەسەر دزی گرتبوو بە چەند ساڵ زیندانیان مەحکووم کرد، کوڕە گوتی پێش ئەوەی بچم بۆ زیندان مۆڵەتم دەن هەتا بچم زمانی دایکم ماچ کەم. چوو لای دایکی، گوتی دایە گیان زمانت دەربێنە هەتا ماچی کەم. دایکی زمانی دەرهێنا و کوڕە زمانی بڕی، گوتیان ئەوە بۆ واتکرد، گوتی ئەوەڵ جار کە دزیم کرد هێلکێکم دزی دایکم هانیدام بۆ دزی گەورەتر، ئەگەر ئەوکات لێم تووڕە بوایە هەر ئەو کاتە دەستم لە دزی هەڵدەگرت. لەم

نەقڵەدا بۆمان دەردەکەوێ کە دەبێ چاودێری منداڵەکانمان بکەین بۆ ئەوەی فێری خوو و خدەی خراپ نەبن، ئەینا بۆخۆمان بەرپرسی کارە خراپەکانیان دەبین.

دەڵێن کابرایەک بە سواری چوو بۆ ماڵێک، خاوەن ماڵ گوتی فەرموو، کابرا خێرا دابەزی و گوتی : ئەسپەکەم لە کوێ وەبەستم، گوتی بە زمانمەوە، ئەگەر بە زمان نەمگوتبایە دابەزە تۆش دانەدەبەزی.

ئینسان هەرچی تووشی دەبێ لە چاک و لە خراپ بە هۆی زمانییەوە تووشی دەبێ، دەڵێن سەلامەتی ئینسان بە زیندانی کردنی زمانەوەیە.

دەڵێن کابرایەک بە نەفەرێکی گوت بچۆ باشترین شتم بۆ بێنە. کابرا چوو زمانی بۆ هێنا، گوتی ئەوجار بچۆ خراپترین شتم بۆ بێنە، دووبارە زمانی بۆ هێنا، گوتی ئەوە یەعنی چی؟! گوتی ئەگەر زمان بە باشی بگەڕێ باشترین شتە بەڵام ئەگەر بە خەراپی بگەڕێ ئەوە خەراپترین شتە.

لە کوردەواری خۆماندا زمان دەکەنە پێناسە بۆ ئینسانی چاک و خەراپ؛ دەڵێن فلانکەس زمان شیرینە یان فلانکەس زمان شڕە.

ئـەمین بـە فیـدای ئینسانـی چـاکە    لـە داخی بـەدفـەڕ بەرۆکـی چاکە

# .: بەشی ٥٩ :.

دەڵێن کابرایەک میوانی شاعیرێک[1] دەبێ، چەند ڕۆژێک دەمێنێتەوە، شاعیر لێی وەڕەز دەبێ و ئەم شێعرانەی بۆ دادەنێ :

میـوان ئـەوەڵ ڕۆژ زێـڕ و یاقووتـە    ڕۆژی دووهەمی هەر زێڕی رووتـە
ڕۆژی سـێهەمی پـۆلا و ئاسـنە    لە ستۆی خانەخوێ تـۆقی گەردنـە
جا مـادام وابـێ ئـەی کـاکی میـوان    هەر زێڕی رووت بەو مەبە بە سندان

دەڵێن جارێک لە مەجلیسێکدا کابرایەکی قسەخۆش دەڵێ : هەر کەس لە ژنی خۆی دەترسێ هەستێ. هەموو هەڵدەستن نەفەرێک نەبێ، دەڵێ هەی ئافەرین، وادیارە تۆ زۆر ئازا و بوێری کە لە ژنی خۆت ناترسی، گوتی کوڕە ئەوەندەی تێهەڵداوم، لاقم دێشێ ناتوانم هەڵستم.

سەعدی دەڵێ عەقڵ بە دەست نەفسەوە زەلیلە و پیاو بە دەست ژنەوە.

---

١- مەلا خدری نژاوێ

جارێک مەلا لە مزگەوت دەیگوت کوڕینە ئەگەر چوونەوە بۆ ماڵ، سڵاوێ بکەن، کابرایەک دەچێتەوە ماڵێ، سڵاو دەکا، پێی دەڵێ ئەو مەکرەت لە کوێ هێناوەتەوە؟! کابرا دەڵێ ماڵی مەلای خەراپ بێ بۆ نەزمی فێری کردم.

کابرایەک دەچێتە لای دوکتۆری ڕەوانناس، دەڵێ دوکتۆر دڵم بە هیچ خۆش نابێ، دونیام لێ بۆتە زیندان، دوکتۆر دەڵێ بڕۆ خۆت بکوژە. کابرا دەڵێ وەڵڵا نوسخەی دەوای چاکت بۆ نووسیم. دوکتۆر دەڵێ ئەگەر دڵت بە هیچ خۆش نەبێ و دونیات لێ بووبێ بە چەرمی چوێلەکە، مردن باشترە بۆ تۆ ئەگەر نا بە قسەی من کە و خەم و خەفەتان لە خۆت دوور کەوە و پەردە ڕەش لەسەر دڵت لابە و ڕووحت بە جوانیەکانی دونیا ڕەوشەن کە و ئاسۆی هیوا و ئومێدت بەرز و بڵند و ڕووناک کەو و خەم بۆ داهاتوو مەخۆ، بە قەولی سەعدی :

ندانـد بـه جـز ذات پـروردگـار  کـه فردا چـه بازی کند روزگار

# .: بەشی ٦٠ :.

دەڵێن کابرایەک چوو بۆ لای مونەججیمێک، گوتی : بۆم تەماشای کتێب کە داخوا ئەمن ئەجەلم بە چی دێ؟ گوتی تۆ مار پێتەوە دەدا. کابرا گوتی : با بچم بۆ لای دوو نەفەری کەش بزانم ئەوانیش وادەڵێن. چوو بۆ لای دووهەمی گوتی : تۆ لە ئاودا دەخنکێی، چوو بۆ لای سێهەمی گوتی تۆ لە دار بەردەبیەوە. چوومە لای ڕەفیقەکەم گوتم دەزانی ئەو ئەستێرە ناسانە لە هیچ نازانن؟ چوومە کن سێ نەفەریان، هەر یەک بە جوورێک مردنی منیان پێشبینی کردووە. سوتفە کابرا دەچێتە ناو باخ. لەسەر دارێک بە خۆ نازانێ مار پێوەی دەدات و لە ئێش و ئۆفی خۆی لە دارەکە بەردەبێتەوە و دەکەوێتە نێو حەوزێکەوە و دەخنکێ، هەر سێک حاڵەتەکەی بەسەر دێن.

من بۆخۆم ئەو حاڵەتەم دیوە، ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی لە چەکۆیە مینوبووسێک هەڵدەدێرێ و دەچێتە ناو چۆم، چەند نەفەرێک تێداچوون، ئەو ڕووداوەش سێ حاڵەتی هەبوون : تەسادوف، هەڵدێران، خنکان. بەجگە لە خوا بە یەقین کەس نازانێ لە کوێ و چۆن دەمرێ. کاکە گیان خەم لە مردن مەخۆ، ئینسان زوو یا درەنگ دەبێ هەر بمرێ، گرنگ ئەوەیە بە چاکی و پاکی بژی و بە چاکی بمرێ، دەڵێن مەرگی بە عیززەت و کەرامەت باشترە لە ژیانی پەست و بە زیللەت، بە قەولی سوارە :

لای هـەڵـۆی بـەرزەفـڕی بەرزەمژی  چـۆن بژی شەرتە نەوەک چەندە بژی

ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوی چوومە سلێمانی. سەردانی زۆرێک لە شاعیران و نووسەرانم کرد. هەموویان لەگەڵم بەلوتف و ماریفەت بوون. تەنیا شێرکۆ بێکەس نەبێ کە زۆر سارد و سڕ بوو. هەرچی ویستم رێی قسانی لەگەڵ وەکەم بێفایدە بوو. ئەوجا هەستام و گوتم : بە دوعا. گوتی : بەخێرچی. دیارە ئەو کەسانەی کە شاعیر و نووسەرن دەبێ زیاتر لە خەڵکی دیکە بە خولق و ماریفەت بن. دیارە لەڕوو دڵسۆزی و گلێییەوە ئەم نەقڵەم گێڕایەوە.

# .: بەشی ٦١ :.

ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی لە گوندی گرویس شەوێک لەگەڵ برادەرێک بە بەر ماڵی دەسگیرانمدا دەڕۆیشتین. پەنجەرەکەیان لەسەر کۆڵان هەڵکەوتبوو. ئەمنیش بە رەفیقەکەم گوت بە پەنجەرەکە هەڵدەگەڕێم داخوا دەسگیرانم دیارە، تۆش ئاگادار بە ئەگەر کەسێک هات بە جۆرێک حالیم کە. پێهەڵگەڕام تەماشام کرد یارەکەم خەریکی کولاودروونە لە خۆشیان ئاگام لە پاشەوە نەمابوو و چووبوومە دونیای دڵداری و لە بەحری عیشق و ئەویندا غەرق ببووم.

عـاشـقـی دامـاو خـەوی حـەرامـە　　　خـەوی بـۆ چـیـیـە یـاری مـەرامـە
هـەتـا تـۆش دەردی عیشق نـەچێژی　　　بـە هیچی دەگـری و لێی گێژ و هێژی

بەهەر حاڵ رەفیقەکەم لە پاشەوە دوو سێ نەقوچکی تێکوتام. لە پەنجەرەکە خۆم فڕێدایە خوار، کە تەماشام کرد ژنبراکەم گەیشتە کنمان، ئەمنیش هیچم پێنەما، گوتم : السلام علیکم، گوتی : علیک السلام، وادیارە قەرزی خۆت وەردەگریەوە.

ساڵی ١٣٦٠ی هەتاوی لە گوندێک لە ماڵێک میوان بووم، دوای نان و چا خواردن نووستم. سەعات دووی نیوەڕۆ بوو هەستام ئەخباری بگرم، بە خۆم نەزانی چوومە سەر هورگی منداڵێک، منداڵ لەخۆ چوو بورایەوە و دەستی کرد بە گریان و شین هەڵگەڕا. منیش دەملاواندەوە. لەو ئەسنایەدا دایکی هات گوتی ئەی خەجاڵەت خۆم لە خەوی کردی. هەر چۆنێک بوو منداڵەکەی ژێر کردەوە، بەختی من نەمرد و هیچی بەسەر نەهات، منیش نەمکوت نەقڵێکی وام لێیەسەر هاتووە تا کوڕەکەیان تەواو زل بوو، سەرتاپای لیباسم بۆ کڕی و چوومە ماڵیان و لە بەرەوەڕا نەقڵم بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش زۆریان پێ سەیر و خۆش بوو. سوتفە ئەو کوڕە بوو بە شاعیر، منیش بە شۆخی پێمدەگوت ئەوە ئەمن بە منداڵی هاتوومە سەر هورگت بۆیە بووی بە شاعیر.

ساڵێک لە تەورێز چوومە لای چەند دوکتۆرێک؛ نەخۆشیەکەمیان بۆ نەبیندراوە، شەو لە مزلێ زۆر ناڕەحەت بووم، برازایەکەم کە میوانی ئەو بووم گوتی : مامە بۆ فاڵێکت بۆ ئەگرمەوە، ئەمنیش گوتم باشە، کە دیوانی حافظی لێککردەوە ئەم شێعرەم بە فاڵ بۆ هاتبوو :

دردم نهفته بــه ز طبیبان مــدعــی      باشـد کـه از خـزانەی غیبم دوا کنند

کە سەرنجم دایە زۆر مناسبیَ حاڵی من بوو، هەروەها بوو بە هۆی تەقوییەتی رووحیم، تازە نەچوومەوە بۆ لای دکتۆران بە کورتی چاک بوومەوە و دەردم لێبڕا.

دیارە نەخۆشی، زۆری وەسوەسە و خەیاڵە وەختێک ئینسان رووحی قەوی بوو زۆر فکر لە نەخۆشی و مردن ناکاتەوە و کەمتریش تووشی نەخۆشی دەبێت.

# .: بەشی ٦٢ :.

دەڵێن مەلایەک کە حەدیسی دەخوێندەوە، عادەتی وابوو چاوی دەنوقاندن، شەوێک دەستیکرد بە حەدیس خوێندنەوە و زۆری لێک کێشایەوە، وردە وردە خەڵکەکە وەڕەز بوون و دەستیان کرد بە هەستان و ڕۆیشتن. تەنیا مجێور مابووئەویش وەڕەز بوو چوو لای مەلا و گوتی مامۆستا هانێ کلیلەکانی مزگەوتت وێدەم کە مەوعیزەکەت تەواو بوو دەرگاکە داخە.

واباشە ئەو کەسەی کە دەیهەوێ قسە بۆ خەڵک بکا کەمپێت و پڕواتە قسە بکا، بە داخەوە ئەمڕۆ زۆربەی ئەو کەسانەی کە وتار بۆ خەڵک دەخوێنێتەوە وەک مەوعیزەی مەلا زۆری توول پێدەدەن.

دەڵێن مەلایەک و جاهیلێک دەبن بە هاوسەفەر، کابرای جاهیل بە مەلای دەڵێ : قوربان ئەوە شەیتان کۆڵم لێنادا و دەڵێ خۆت بکوژە. مەلا دەڵێ بە قسەی مەکە، خۆت بە هیلاک مەدە، جاهیل دەڵێ ئەوە بە لەعنەتم کرد. دووبارە دەڵێ مامۆستا شەیتان دەڵێ خەنجەرێکی لە هورگی مەلای دە. دەڵێ : بە لەعنەتی کە، خۆت تووشی قەتڵی نەفس مەکە، تۆزێکی دی ڕۆیشتن، کابرا گوتی مامۆستا ئەوە شەیتان دەڵێ سەد هەزار تمەنی بدە بە مامۆستای، مەلا تۆزێک ڕاوەستا و گوتی : وەڵڵا ئینسان جارجار بە قسەی شەیتانیش بکا باشە.

دەڵێن لەوەتە دونیا دروستکراوە، فرشتەیەک لە ئاسمان دەهۆڵێکی بە دەستەوەیە مەئمورر کراوە هەر کات مەلایەک نانیدا بە کەسێک دەهۆڵ بکوتێ، لێی دەپرسن تا ئێستا دەهۆڵەکەت کوتاوە؟! دەڵێ ناوەڵڵا ... .

دیارە ئەم نەقڵە هەر بۆ مەلایان هەڵبەستووە ئەینا زۆر کەس هەن لە مەلایان کوێرنانترن.

دەڵێن کابرایەک میوانی کابرایەکی کوێرنان دەبێ، دەڵێ فلانکەس جا بە منداڵەکەت بڵێ بۆ نیوەڕۆ زۆر زەحمەت نەکێشن، هەر فرووجێکی بە تەڕەکەباب لێنێن و دوو سێ دەوری برینجی لەگەڵ سازکەن بەسە، بە ناچار کابرا تووش دەکا نان و خوانێکی جوان ساز کات. ئەوەیە دەڵێن : پوور نەدەترێ بە زۆریان دەتراند.

خوشکەزایەکی قسەخۆشم هەیە بە ناوی وەفا، دەڵێ : هەر کات میوانیماڵێک دەبم کە دەچم بۆ سەر سفرە تەواو و کەماڵ پڕ بە دڵی خۆم نان دەخۆم و بێدڵی خۆم ناکەم. چۆن میوانبوون دوو حاڵەتی هەیە : یا ئەوەیە کە کابرای خانەخوێ زۆر بە هاتنت خۆشحاڵە یان ئەوەی کە پێت نارەحەتە، منیش تازە چووم بۆ ماڵێ، کە وایە زۆر دەخۆم بۆ ئەوەی زۆر خۆشحاڵی کەم یان بۆ ئەوەی بە زۆر خواردنەکەم زۆرتر خەفەتی پێبدەم.

لـە خـاکی کوردەواریـدا ئـەوەی چازانـە رووزەردە
به سەرشۆڕی دەژی چاوی لە دەستی مەرد و نامەردە
ئەوەی هەقبێژە جێی زیندانە یا ئەشکەوت و بن بەردە
بەشـی کـوردێکی زانـا لـەم ولاتـە مەینـەت و دەردە

ئەوەی نەتویست بڵێ : رەببی بە دەردی کوردی زاناچی. «هێمن»

بە داخەوە ئەوانەی کە زانان تا لە ئارادان، قەدریان نازانن، بە قەولی شاعیر :

پیاوی زانامان نـایـەتـە بـەر دڵ        هەتا ئەو رۆژەی دەچێتە بن گڵ

دیارە ئینسانی زانا و دڵسۆز و شاعیر هەرچی بە سەری دێ لە پێناو گەل و نیشتمانە، بە قەولی شاعیر : کێ لە رێی خەڵکا وەکوو شاعیر دەسووتێ شەم نەبێ.

هەروەها مەلای کۆیی دەڵێ :

ئەوەی زانایە ناو جەرگی پەلاسە        ئـەوەی نادانە نـازانـێ چ بـاسـە

بەلام هەر ئەوانە سەرکەوتوون و لەناو مێژوودا بۆ هەمیشە ناویان بە چاکی و پاکی هەر دەمێنێ، بە قەولی نامی :

مەرد ئـەو کەسـەیە بـۆ نیشـتمانی        خۆی بکا بە قۆچ، قـۆچی قوربـانی
چونکە نیشتمان بێشکەیە بـۆ گـەل        مایەی ژیانـە بـۆ گـەل تـا ئەجـەل

# .: بەشی ٦٣ :.

دەڵێن جارێک دوو کوڕ کە عەقیدەی کۆمۆنیستیان دەبێ تووشیان لە مەلایەک دەکەوێ. یەکیان ریشی مەلا ماچ دەکا، کاتێک کە لە مەلا دوور دەبنەوە ئەوەی کە پێدەکەنێ و دەڵێ ئەرێ ئەتۆ بۆ ریشی مەلات ماچ کرد. ئەمە چ سرڕێکی تێدابوو؟ خۆ تۆ لە دونیادا رقت لە مەلا و دینی مەلایە. دەڵێ : تۆ نازانی ئەو مەلایە چەند خەراپە، لە پەنا دین هەزاران گەندەکاری دەکا و خزمەتێکی باشی بۆ ئێمە هەیە، رۆژێ سەدان کەس لە ئوممەتی محەممەدی لە دین وەردەگێڕێ و ئیسلام عەیبدار دەکا بە قەولی شاعیر :

دڵی عالم کە خاڵی بێ لە عیرفان — لە ئەعمالا نەبێ حوسنی نەمایان
بە ریش و مێزەر و دەسماڵی رووسی — وەکوو شەمعە لەسەر قەبری مەجووسی

دیارە ئینسان پابەندی هەر دین و مەکتەبێک بێ، دەبێ راست و درووست بێ و خەیانەت بە قانون و بەرنامەی رێبازەکەی نەکات.

دەڵێن جارێک لۆتیەک لە مەلای پرسی ئەرێ دونیای ئێوە خۆشترە یا دونیای ئێمە؟! مەلا گوتی ئەتۆ دەزانی. کابرا گوتی : دونیای ئێمە گشتی هەر شادی و شادمانی و هەڵپەڕینە و پێکەنینە بەڵام دونیای ئێوە هەمووی تەعزییە و ماتەم و شین و شەپۆڕە.

# .: بەشی ٦٤ :.

کابرایەک بۆی گێڕامەوە گوتی : شاگردی کەبابخانەیێک بووم، رۆژێک کابرایەکی مەشرووبی شووشێکی ئارەق هێنا گوتی بۆم لە یەخچاڵ هاوێ تا سبەینێ، گوتی منیش شەو کە وڵات چۆڵ بوو شووشە ئارەقەکەم هەڵڕشت و پڕم کرد لە میز، بەیانی کە هاتەوە گوتی شووشە ئارەقەکەم بۆ بێنە، بۆم هێناو دەستیکرد بە خواردنەوە، دوای تۆزێک گوتی فلانکەس ئەو شووشە ئارەقە وەک ئارەقی جاران ناچێ، هەم سوێر بوو هەم پێشێ سەرخۆش نەبووم. دیارە کاری ئەم شاگردە باش نەبووە چۆن قەدیمی گوتوویانە عیسا بە دینی خۆی و مووسا بە دینی

خۆی، واتە ناحەقی کردووە ئەگەر ویستبێتی بەم جۆرە پێش بە کاری خەراپی کابرای ئارەق خۆر بگرێ و هەروەها خەیانەتی کردووە لە ئەمانەتێکدا کە بەوی راسپێندرابوو.

دەڵێن جارێک کابرایەکی مەست دەپاڕایەوە دەیگوت : چۆن دەم و چاوی خۆم بە میز پاک دەکەمەوە، تۆش ئاوا لە گوناهانم پاک وەکە.

دیارە ئینسان کە سەرخۆش بوو، زۆر شتی هەڵە و پەڵەی بە زاریدا دێت، لەگەڵ ئەوەش بەندەناس خوایە. زۆر کەس بە رواڵەت پەپوولەی بەهەشتن بەڵام بە قەولی کوردی گورگن لە پێستی مەڕدان و هەرچی خەراپە و فرت و فێڵ و مەردووم‌ئازارییە دەیکەن و خۆشیان بە باشترین دەزانن، ئەوانە مەستی خوێنی خەڵکن، ئەوانەی تریش مەستی ئاوی ترێن، بە قەولی خەییام :

تو خون کسان می‌خوری و ما خون رزان          انصاف بـده کـدامـمان خـونخـوارتـریـم

هەروەها سەعدی دەڵێ :

گاوان و خـران بـار بـردار          بـه از آدمـیـان مـردم آزار

سووسەنیش دەڵێ : «می بخور، منبر بسوز، مردم آزاری مکن.»

# .: بەشی ٦٥ :.

دەڵێن عومەری خەییام باوەڕی بە «تەناسوخ» هەبووە، ڕۆژێک دەبینێ کابرایەک گوێدرێژێکی لە پێشەوەیە بەلای مزگەوتێکدا دەهات، کەرەکە لاقی چەقاندن و هەرچی کابرا لێیدا نەڕۆیی، خەییام چوو بە گوێیدا سرتاند و کەرە لووس ڕێگەی گرتەبەر. کابرا زۆری پێ سەیر بوو، گوتی قوربان ئەوە چت پێگوت ئاوا ڕۆیی؟! خەییام گوتی ئەوە رووحی ئەو گوێدرێژە کاتی خۆی لەبەر کابرایەکی مجێور دابووە، موتەوەللی ئەم مزگەوتە زۆری ئەو مجێورە ئەزییەت داوە، ئێستاش لە ترسی ئەو موتەوەللیە نەیدەوێرا بەوێدا بڕوا، ئەمنیش پێمگوت بڕۆ مەترسە فلانکەس نەماوە و ڕۆیی.

دیارە ئینسانی مەردوم‌ئازار لەدوا مردنیش خەڵک هەر سڵەی لێدەکەن، سەڵا و بەدبەختی بۆ ئەوچەشنە کەسانە کە بۆ هەمیشە دەبنە نیشانەی تیری نەفرین و بێزاری خەڵک.

دەڵێن لە گوندێک کەرێک دەبێ هەر کامیان لە خەڵکی دێ بچێ بۆ سەفەر سواری ئەو کەرە دەبوو. ڕۆژێک مەلای ئاوایی دەیهەوێ بچێ بۆ سەفەر، کەرەکە دێنن کە مەلا سواری بێ.

کەر دەست دەکا بە لەقە هاویشتن و گاز گرتن. کابرایەک بە گوێیدا دەسرتێنێ و دەڵێ ئەرێ خۆ قەت واتنەکردووە ئەمڕۆ بۆ وادەکەی؟ دەڵێ ئەوە مەلایە بەخوا سوارم بێ قەت دانابەزێتەوە.

نازانم مەلای بەدبەخت چ گوناهێکیان کردووە کە هەرچی نەقڵی سەیرە بۆیان هەڵبەستوون.

دەڵێن جارێک داوود پاشا بەَ موفتی زەهاوی گوت : ئەرێ «عەمر» چ تاوانێکی کردووە کە فەقێکان هەر دەڵێن : «ضَرَبَ زیدٌ عمرواً»، ئەویش دەڵێ ئەوە واوێکی لە داوودی دزیوە.

# .: بەشی ٦٦ :.

دەڵێن جارێک ژنێک لە ژنێکی دەپرسی : ئەرێ پلاوی چۆن لێنێم، ژنەش دەڵێ : ئەوەندەی ئاو تێکە و ئەوەندەی ڕۆن و خوێ تێکە و ئاوای دادەڕێژی و ئاوای دم پێبێنە. خولاسە هەرچی پێی دەڵێ دەڵێ دەزانم، لە ئاخریدا پێی دەڵێ تەپاڵێکیشی لەسەر دانێ، دەڵێ ئەویش دەزانم.

دیارە ئەم ژنە زۆر لەخۆ ڕازی و نەزان بووە، بەهەر حاڵ ئەو کەسەی کە دەیهەوێ شت فێر ببێ لە لای ئەو کەسانەی کە وەستان، دەبێ گوێڕابگرێ، نەڵێ خۆ دەیزانم دەنا بە مەرەد ئەو ژنەی دەچێ.

دەڵێن پیاوێک بەیانیەک زوو لە خەو هەستا، بە ژنەکەی گوت : ئافرەت ئەمشۆ خوا بەخێری بگێڕێ، خەونێکی زۆر سەیرم دیوە، بۆت دەگێڕمەوە بەڵام نەچی بۆ کەسی وەگێڕی، ژنەکەی گوتی وەعد بێ، کابرا گوتی ئەمشۆ لە خەومدا قەلێکم لە سەر هەڵفڕی. ئەو زەمانە قۆتان دەبێ، ژنە زوو گۆزە ئاودەداتێ و دەڕوا بۆ کانی و ژن و ژاڵان لە خۆی کۆ دەکاتەوە و دەڵێ ژنینە ئەمشۆ پیاوەکەم لەخەونیدا حەوت قەلی لە سەر هەڵفڕین، ئەوە قەرار بوو نەیگێڕێتەوە کەچی یەک قەلیشی کرد بە حەوت قەل.

دیارە ژن دەبێ مەحرەمی ڕاز و نیازی مێردەکەی بێ، سرڕ و فرێ ماڵێ نەباتە دەرێ و هاودەمی شین و شایی مێردەکەی بێ و خەیانەت بە ماڵ و حاڵ و نامووسی نەکا، لابەری خەم و پەژارەی بێت، گوڵی بە بۆنی شەوانە بێ و باوەشێن و فێنکایی دڵ و هۆی حەسانەوەی ڕۆژانە بێ، بۆ شەوی دڵتەنگی و پەژارە مەلی بلاوێنی بەیانی بێ و پیاویش بۆ ژن دەبێ بەو چەشنە بێ و ژن لە سایە و پەنای وەحەسێ. بە قەولی سەعدی :

اگر همه روز غمخوری غم مدار چو شب غمگسارت بود در کنار

# .: بەشی ٦٧ :.

کاک رەحمانی برام لە ئەسفەهان زیندانی بوو، ئەمنیش چووم بۆ مولاقاتی، لە پێش ئەوەدا بگیرێ پێکەوە زانیاری زۆرمان سەبارەت بە رووداوەکانی رۆژگار هەبوو، نەقڵ و گوزاریشی رۆژانەمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، دوایی شەرایەتی رۆژ گۆڕا و من ملم لە سەودا و مەعامەلە ناو و چوومە دونیایەکی دیکەوە. خولاسە کاتێک لە ئیسفەهان چوومە زیندان لەگەڵ رەحمان لە گۆشەیەکی حەساری زیندان دانیشتین، دوا بەخێرهاتن و چۆنی چاکی گوتی : دەی حەمەدەمین لە بەرەوەڕا بە وردی نەقلانم بۆ وەگێڕە. هەر ئەو پرسیاری کرد و ئەمن وڵامی بە درۆم دانەوە، لام وابوو ئاگای لە دەرێ نەماوە، هێندێکی بەڵێ بۆ گوتم و گوتی حەمەدەمین ئەوەی دەیڵێی هیچی وا نییە. وا دیارە لەگەڵ پووڵی تێکەڵ بووی و ئاگات لە ئەوزاع و ئەحواڵی ئێستا نەماوە، دوایی ئەم نەقڵەی بۆ گێڕامەوە و گوتی : کابرایەک لەسەربانی هێند دێتە پێشەوە خەریکە بەر وەبێ، هێندە مەیە پێش، ئەو جار ئەوەندە دەچێتە پاشەوە کە خەریک دەبێ بە پاشدا بەروەبێ، بەڵام تۆش نە هێندە وەرە پێش و نە هێندە بچۆ پاش، نەوا و نەوا کاسبیش بکە و ئاگاشت لە وەزع و حاڵی رۆژ بێ.

کاک رەحمان بۆی گێڕامەوە گوتی : لەگەڵ مەنیجەی خوشکم لە تەوریز بووین، بردبووم بۆ دوکتۆر، لە پێش ئەوەیدا بگەینەوە مزڵێ گوتی : میرزا رەحمان کاری سەرئاوێم هەیە و زۆرم تین لەسەرە، فریای مزڵێ ناکەوم، دەڵێ منیش لە گۆترە لە دەرگای ماڵێکمدا و بە تورکی حاڵیم کردن. دەرگای لێهەڵگرتین و حاجی مەنیجە چوو ژوور و خۆی خاڵی کرد و هاتەوە دەر، کە هاتە دەرێ گوتی : ئەرێ میرزا رەحمان ئەو ژنەتیوە بۆ وا بێ نێوچاوان و گرژ و تاڵ و بێ ماریفەت بوو، گوتم هەقیانە، ئەتۆ لەسەردەشتێرا هاتووی، دەزانی چت بە دیاری بۆ هێناون؟! دەتهەوێ سەمات لەپێش بکەن بۆو دیارییە رەنگینەت.

حاجی مەنیجە بە منداڵی هەر دوو دەستی سووتاون و بە گەورەییش لاقێکی بە مین پەڕیوە.

کاک رەحمان زۆر ئەهلی جەفەنگ و شۆخییە و مەجلیس‌خۆش، کە دەست دەکا بە قسە، بەرامبەرەکانی هەموو لەشیان دەبێ بە گوێ و مەجلیس دەبێتە مەجلیسی قاقا و پێکەنین، هەروەها ئینسانێکی دڵسۆز و بە پەرۆشە بۆ گەل و وڵاتەکەی، ئێستا پەڕیوەی هەندەرانە.

ئەمین و بۆسۆ هـاوبیر و رازن    لە ئاسۆی ئەدەب مەلی بە نازن

# .: بەشی ٦٨ :.

دەڵێن دوو نەفەر کاروانچی شەوێ بە لای بێستانێکدا دەڕۆن. دەچن کاڵەک و شوتیان لێوەکەن، یەکیان هەر لە پێشەوە شووتی لێدەکردەوە و ڕۆیی، ئەوەیکە گوتی وەڵڵا من کاڵەکم پێخۆشترن. کاڵەکەکانیش دوورتر بوون، کابرا چوو بۆ نێو کاڵەکەکان، پانتۆڵەکەی دانا و پڕیکرد لە کاڵەک، لەو بەینەدا بێستانەوان وەخەبەر هات و کاڵەک دزی گرت و وەبەر شەقانی دا و کابرای بێستانچی دەیگوت :

تێهەڵــدە لــە فلانــی رووتــی        کاڵەک خۆشترە لە شووتی؟!!

دەڵێن لە دێیەک دوو ماڵ دوژمنی و ناکۆکیان لە بەیندا دەبێ، ڕۆژێک یەکیان دەستەی سازدەکا و دەچێ بۆسەر ماڵی دوژمنەکەی، سوتفە خاوەنماڵ لە ماڵ نابێ بەڵام دوو نەفەری میوان لێدەبن، تێر و پڕ لە میوانەکان دەدەن و دەڕۆنەوە. کاتێک خانەخوێ دێتەوە و نەقڵی بۆ دەکەن، ئەویش خێرا دار و دەستە ئامادە دەکا و دەچێ تێر و پڕ لە میوانی کابرای دوژمن دەداتەوە، میوان هاواریان بڵند دەبێ کە ئەی هاوار بۆ خاتری خوا ئێمەی میوان تاوانمان چییە؟!!

دیارە کاری هەردووکیان نیشانەی نەزانی و بێفەرهەنگی بووە، ئەینا خۆ بە خۆ دوژمنایەتیان هەبووە، میوانی فەقیر چ تاوان و خەتایەکیان هەیە، ئەوەیە دەڵێن : بە کەرێ ناوێرێ ڕمڕم لە کورتانی دەدات.

هاوکات لەگەڵ نووسینەوەی ئەم کتێبە مەهدی کوڕم لە چین بوو. تەلەفوونی بۆ کردم، لەدوا چۆنی چاکی گوتی : باوکە، ئێرە زۆر خۆشە، بە تایبەت لە باری سروشتەوە. گوتم : بە قەت وڵاتی خۆمان خۆش نییە، هەر وەکوو شاعیر لەو بارەوە گوتوویەتی :

سەیری لوبنان و گەڕانی چین و ماچین بۆ بکەم

تا ببێ هۆبە و هەوار و چیمەن و کوێستانی کورد

ئاوی گۆزەڵەی خاکی کوردستان خۆشترە لە ئاوی سەرچاوەی لوبنان. «١٣٨٩ی هەتاوی»

ئەمنیش جارێکی میوانم هەبوون لەناکاو کابرایەکی زۆرخۆر کە زۆرخۆریەکەی مەشهوور بوو پەیدا بوو و لەسەر سفرە لەگەڵمان دانیشت. بە خێزانم گوت : ئافرەت بێنە تەواوی بنکرەکەم بۆ لەسەر دەورییەک دانێ هەتا لە پێش کابرا زۆرخۆرەکەی دانێم، ئەینا تەواوی

چێشت و نانی سازت کردووە دەیخوا و خۆم و میوانەکانم دەملەپووش دەبین. خولاسە بنکرەم لەپێش دانا، هێندەی خواردبوو مڕ ببو، خوات حەسێنێتەوە نەیتوانی هیچ شتێکی کە بخوا.
بێگومان زۆر خواردن زۆر قەباحەتە و خەراپە بۆ خۆی و بۆ خانەخوێ.

# .: بەشی ٦٩ :.

سالی ١٣٥٥ی هەتاوی لە گوندی گروێس منداڵ بووم، شوانی مێگەلێ بووم، رەفیقێکم هەبوو هەموو رۆژی لەگەلم دەهات بۆ کێوی و بۆخۆمان گالتە و مەلەمان دەکرد. رۆژێک باوکی نەیهێشت لەگەلم بێت، منیش ئەو رۆژە لە کێو بەتەنێ مامەوە و زۆرم وەڕەزی رەفیقەکەم کرد، قوڕەقوڕ لە بانگی گریانمدا، لەو ئەسنایەدا چرپەیەکم گوێ لێبوو کە ئاورم دایەوە رەفیقەکەم بوو، لە خۆشیان لە قاقای پێکەنینمدا، گوتی : ئەرێ تۆ نەدەگریای؟! گوتم : نا، هەر پێدەکەنیم ... . بە راستی دونیای رەفاقەت دونیایەکی زۆر خۆش و بێخەم و خەیالە.
جارێک دایکم زۆری لێدام و دەستم کرد بە گریان، کابرایەک گوتی ئەوە بۆ دەگری؟ گوتم دایکم لێیداوم، گوتی دەک جێی دەستانی شین بێتەوە.

بـــە بـیـرەوەری دەوری منـالـیـم سەردەمی خۆشی و زۆر بێخەیالیم

بەهار بوو، لە کێوی سەیری گوڵ و گوڵزار و سارا و دەرودەشتم دەکرد، گوێم لە قاسپەی کەو، نەغمەی مەلان و هاژە و هاڕەی چۆم و رووبار و سەرچاوان گرتبوو و هەر وەک شاعیر دەلێ :

کەوێک قاسپاندی بـەری بـەیانی وڵامـی دامـێ بـە دەنگـی جـوانی
گـوتی نـەورۆزە و کـاتی شـادییە پیرۆز بێ لە گشت دۆستانی گیـانی

دەلێن کابرایەک چۆ لای پیاوچاکێک. گوتی فلان شتم لێونبووە. هاتووم کە بە کەشف و کەرامەت بۆم وەبینی. پیاوچاک گوتی : هەی نەزان؛ خۆ من عیلمی غەیبم نییە، تەنیا خودا بە شتی نادیار ئاگادارە.

(ای دل تـا کـی فضـولیّ و بـوالعجبی از مـن چـه نشـان عاقبـت مـی‌طلبـی) .
سرگشته بـود خـواه ولـی، خـواه نبـی در وادی مـــا آذری مـــا یُفْعَـــلُ بـــی
اســرار ازل را نــه تــو دانــی و نــه مــن وین حل معما را نه تو خوانی و نه من

ئەو سەرچاوانەی لەسەر هەردانن فرمێسکی چاوی جوانەمەرگانن
نێرگزی چاوکاڵ دەمەو بەهاران کە دەڕۆین لە لای دەشت و کۆساران
چاوی جوانانە کەوتۆتە بن گڵ نیشانمان دەدا گەردوون لەسەرچڵ
دەزانی میوە بۆچی شیرینە شەکرەلێو نووستوون لەو ژێرزەمینە
هەواکەی خۆشە مەڵبەندی نەبوون هەموو کەس بە تویێی کراسێک نوستوون

بە هەرحاڵ لەسەر بەردێک دانیشتبووم و بە دەنگێکی بەرز دەمگوت: لاتەلاتە ... نەجارێک و نە دەجار، هەر ئەوەندەمدی کابرایەک لەبن دەوەنێک بڵێند بوو گوتی ماڵت خەرا نەبی، یەک ساعەتە گوێم بۆ شل کردووی داخوا دوای لاتەلاتەی دەبێتەچی. کەچی هیچ خەبەرێک نەبوو.

منداڵبووم گەورەترین خۆزگە و هیوام ئەوە بوو رۆژێک بێت بە دڵی خۆم خورما بخۆم - ئەو نەقڵەتان پێ سەیر نەبێ، خەڵک فەقیر بوو و منداڵی ئەو زەمانە تێری نەدەخوارد لە شت بە ئارەزووی خۆی - خولاسە کاتێک زلبووم چووم بۆ سلێمانی، بایی دە فلسم خورما کڕین، یەک کیلۆ دەبوون، لەسەریان دانیشتم هەتا تێرم لێنخواردن و بە ئاواتی خۆم گەیشتم. لەوەش سەیرتر ئەوە بوو یەک مانگ کارم بۆ مامم کرد، هەموو حەقی زەحمەتەکەم جەمێک نان و هەڵوا بوو.

بابم دەچوو بۆ سلێمانی تیکوڵێ لیمۆ و پرتەقاڵی بۆ دێنایەوە و ئێمەش بە بۆنمان دەکردن، خوانەکا بۆ خواردن هەبان. کابرایەکی لێبوو لە گروێس کە لە شار دەهاتەوە لێمان دەپرسی : ئەرێ شار خۆشە؟! دەیگوت ئەریوەڵلا زۆر خۆشە. ئەگەر زۆرت برسی بوو بەلای کەبابخانەدا دەڕۆی و تێر دووکەڵێکەی هەڵدەلووشی! تەواو تێر دەبی.

دەڵێن منداڵێک بە بابی گوت : بابە کەبابم بۆ بکڕە، باوکی گوتی : کەبابت هەبێ کەبابت هەیە، کەبابت نەبێ کەبابت نییە، واتە ئەگەر باوکی خۆت هەبوو ئەوە کەبابت بۆ دەکڕێ، بەڵام کە باوکت مرد تازە کەس نییە کەبابت بۆ بکڕێ.

بە قەولی سەعدی :

من آنگه سر تاج ور داشتم کە سر در کنار پدر داشتم

# .: بەشی ٧٠ :.

سەعدی دەڵێ میوانی کابرایەکی پیر بووم؛ شەوێ لێم پرسی : چەند منداڵت هەیە؟ گوتی تەنیا یەک کوڕم هەیە، ئەویش چوومە سەر قەبری فلان پیاوچاک لە خوا پاڕاومەوە کە خوا

ئەولادێکم داتێ و خودا ئەو کوڕەی دامێ. سەعدی دەڵێ گوێم لێبوو کوڕەش لەبەر خۆیەوە دەیگوت : خۆزگە بە قەبری فلان پیاوچاکم دەزانی منیش دەچووم لەوێ لەبەر خوا دەپاڕامەوە کە باوکم لێبستێنێتەوە.

تەفاوەتی مەعامەلەیان زۆر بوو، بابەکە هەزار ئومێد و ئارەزووی بە کوڕەکەی بوو و کوڕەکەش لە بابی وەڕەز و بێزار بوو.

جارێک باب و کوڕێک شەڕیان دەبێ، کوڕە بابی لەدەست دەکوژرێ، کوڕە دەست دەکا بە لەخۆدان و شین و شەپۆڕ و دەڵێ : ئەی باوکەڕۆ هەر کۆڵت لێنەدام هەتا خۆت پێ بە کوشتن دام. ساڵێکیان چوومە دێیەک، سوتفە کابرایەکی ئەم دێیە مردبوو، جەماعەتێکی کەش لە مزگەوت مابوونەوە خەریکی قولیچە خواردن بوون. ئەمنیش لەکن دوو سێ جەوانان دانیشتم و وێڕای وان دەستمکرد بە قولیچە خواردن. گوتم : ئەو کابرایەی کە عەمری خوای کردووە هیچ کوڕ و کەس و کاری هەن؟ جەوانێک لە تەنیشتمەوە بە خەندەوە گوتی ئەمن کوڕی ئەوم. گوتم مردووت مرێ چۆن بابت مردووە و لە قولیچەخواردنی خۆت نانێی و لەگەڵی نەچوویە سەرقەبران. گوتی : کوڕە خوا عەفووی کا، قولیچەکە لە کیس خۆم نادەم، دوایی بۆم دەرکەوت کە بابی لە خەفەتی ئەم کوڕە کە چەند ساڵان زیندانی بووە تووشی نەخۆشی بووە و هەر بەو دەردەوە مردووە.

لە دێیەک میوانی کابرایەکی بەساڵاچوو بووم، گوتم خاڵە ئەولادت چ هەن؟ گوتی وەجاخکوێرم هەرچەند دوازدە کوڕیشم هەن ئێستا بێکەس و بێدەر لە دیوێکدا ماومەوە، کەس ناڵێ بابە قونت چەند جەواڵ کای دەبا.

| | |
|---|---|
| گۆچان بە دەست و بە ئاه و ناڵە | کەس نییە بڵێ چلۆنی خاڵە |
| دیوەزمەی پیری هاتۆتە کۆڵم | لە بۆیە وەها دەست و پێ کۆڵم |
| زەربول مەسەلە و قاعیدەی کوللە | شێر کە پیر دەبێ، پێی دەگرن کوللە |
| | ئەمین |

گەنجەکان قەدر و ڕێزی دایک و باب بزانن، یەقینەن هەڵسوکەوتی ئێوە چۆن بێ لەگەل دایک و بابتان منداڵان و وچەی داهاتووش ئەو هەڵسوکەوتەیان لە بەرامبەر وەدا دەبێ.

دەڵێن قەومێک هەبووە کە بابیان پیر دەبوو، دەیانبرد لەسەر شاخێکی بەرز هەڵیان دەدایە خوار. ڕۆژێکیان کوڕێک کە باوکی پیر دەبێ دەڵێ بابە ئەمن تۆ لەم شاخە بەرنادەمەوە و ناتکوژم تا دوارۆژ کوڕەکەی من وا لەمن نەکات.

قۆناغی پیری قۆناغێکه که هەموو ئینسانێک له پێشیەتی کەواته تا جەحێڵین و له تواناماندا هەیه رێزی پیرەکان و دایک و بابان بگرین بۆ ئەوەی که پیر بووین رێزمان لێ بگریتەوه؛ به قەولی عەرەب : «لیتَ الشبابَ یَعُودُ یَوْماً فَأُخْبِرَهُ بِماَ فَعلِ الْمَشِیب» واته : خۆزگه جەوانی رۆژێک هاتبایەوه بۆلام و ئەقڵم بۆ بکردایه که پیری چ مەرەدیکم پێدەکات، ئەویه که سەعدی دەڵێ :

به پیران کهن کن دست‌گیری    که در پیری بدانی قدر پیری

واته دەستی پیران بگره و ئاگات لێبێ چونکه که پیربووی به مەرەدی پیری دەزانی، دەتوانی بۆ پێکەنین «پێ»ی وشەی «پیری» ئاخر بگۆڕی به «کاف».

# .: بەشی ٧١ :.

ئەبله به خەیاڵ قەت به ماڵ نابێ    شەوگاری پاییز قەت بەساڵ نابێ

کابرایەک گوتی دەبێ لەیلایێ ببینم داخوا زۆر جوانه که مەجنوون ئەوا عەودالی بووە؟! که چاوی پێکەوت دیتی ئافرەتێکی رەشکەڵه بوو؛ گوتی : خۆ جوان نییه، ئەوه مەجنون عاشقی چی بووە؟! مەجنون که دەبیستێتەوه دەڵێ : خۆزگه ئەو کابرایه له چاوی منڕا تەماشای لەیلای بکردایه جا بۆی مەعلووم دەبوو که لەیلا چەند جوان و شیرینه.

اگر در دیده مجنون نشینی    به جز از خوبی لیلی نبینی

دەڵێن جارێک مەجنون چوو بۆ گۆڕستان له منالێکی پرسی : ئەرێ دەزانی قەبری لەیلا کامەیه؟! منالْ گوتی وادیاره تو عاشق نی ئەینا هەر به بۆنی قەبرەکەی لەیلات دەدییەوه.

دەڵێن جارێک له مەهاباد کابرایەک چاوی به وەفایی کەوت و زانی که عاشقی شێخی نەهرییه. ویستی به نێوی توتنی نەهرییه فێڵ له وەفایی بکا و توتنی پێ بفرۆشێ، کابرا به دەنگی بڵند هاواری کرد : توتنی نەهرییه، توتنی نەهرییه ....، وەفایی گوتی دا وەره خاڵه، به قوربانی خۆت و توتنی نەهرییەت بم. خاڵەش خۆشی خۆشی توتنەکەی بۆ برد، وەفایی توتنەکەی وەرگرت و بۆنی پێوه کرد و گوتی خاڵه دەبێ ببوری، توتنەکەت بۆنی نەهرییەی لێ نایێ.

به عالم هر دلی کو هوشمند است    به زنجیر جنون عشق بند است

واته هه‌ر دڵێک که به هۆش و گۆش بێ، گیرۆده‌ی داوی دڵدارییه. ئینسان ناچاره که ده‌بێ دڵ به‌شتێکه‌وه ببه‌ستێ و عاشق به شتێک بێ و به‌ره‌و مه‌عشووقه‌که‌ی بڕوا هه‌تا به وه‌سڵی شاد ده‌بێ، جا ئه‌و مه‌عشووقه مه‌جازی بێ، یان حه‌قیقی.

متاب رو از عشق گرچه مجازی است    که آن بهر حقیقت کارسازی است

به‌هه‌رحاڵ دونیای دڵداری دونیایه‌کی تایبه‌تیه و دڵدار به ده‌ردی دڵدار ده‌زانێ، ده‌ڵێن به‌سه‌د دوکتور به‌قه‌ت ده‌رده‌دارێک نازانێ.

## .: به‌شی ٧٢ :.

ده‌ڵێن کابرایه‌کی نه‌ته‌وی و بێ‌بڕوا به‌تانه‌وه به ئیمامی عه‌لی ده‌ڵێ : ئه‌من ده‌وڵه‌مه‌ندم و تۆ نه‌دار. ئیمامیش ده‌ڵێ : سه‌رووه‌ت و سامانی تۆ له به‌ین ده‌چێ و بێبه‌قایه و گه‌ر مردی که‌س ناڵێ فلانکه‌س هێنده هێنده ده‌وڵه‌مه‌ند بوو به‌ڵام ئه‌من که خوا عیلم و زانیاری پێداوم غه‌نه‌یه‌کی نه‌بڕاوه‌یه، له دوای خۆشم خه‌ڵک سوودی لێوه‌رده‌گرن، که‌وابوو ئه‌من به به‌ش و باری خۆم رازیم. «رَضینا قِسْمَةَ الْجَبّار فینا لَنا عِلْمٌ و لِلْأعْداءِ مالٌ فَاِنَّ الْمالَ یُفْنی عَنْ قَریبٍ و اِنَّ الْعِلْمَ باقٍ لا یَزالُ.»

ده‌ڵێن «نه به نه‌گبه‌ت بنازه و نه به سه‌رووه‌ت.» به چاوی خۆم دیتم کابرایه‌کی ده‌وڵه‌مه‌ند رۆژێک له بێوه‌ژنێکی فه‌قیر تووڕه بوو، رێکه‌وت کوڕی ئه‌و بێوه‌ژنه بوو به زاوای ئه‌و کابرایه. سوتفه کابرا مرد و ئه‌ولادی نێرینه‌ی نه‌بوون، کوڕی ئه‌و بێوه‌ژنه بوو به میراتگر و واریسی ئه‌و کابرایه ده‌وڵه‌مه‌نده. ئه‌وه‌یه ده‌ڵێن «هیچ نه‌خۆری بۆ چه‌کمه بۆری» که‌وابوو ئینسان به سه‌رووه‌ت و سامان خۆی لێنه‌گۆڕێت.

## .: به‌شی ٧٣ :.

ده‌ڵێن شا عه‌بباس شه‌وێک له لیباسی شه‌خسیدا ده‌چێته ده‌ری شار ته‌ماشا ده‌کا، ئه‌وه سێ نه‌فه‌ر پێکه‌وه دانیشتوون. چوو لایان و گوتی ئێوه چ کاره‌ن، گوتیان دزین و ده‌مانهه‌وێ بچین غه‌زنه‌ی شا عه‌بباس بدزین. گوتی : منیش له‌گه‌ڵ خۆتان خه‌ن، گوتیان باشه به‌ڵام هه‌ر کام له

ئێمە هونەرێکمان هەیە بۆ دزی کردن، گوتی بزانم هونەرەکەتان چییە؟ یەکیان گوتی هونەری من ئەوەیە کە سەگ چاویان پێکەوتم ناوەڕن، دووهەمی گوتی : من دەتوانم هەموو قفڵەیەک هەڵگرم، سێهەمی گوتی : منیش لەشەوی تاریکدا چاوم بەهەر کەسێک بکەوێ لە هەر جێیەک بێ دەیناسمەوە. شا عەبباس گوتی منیش هەرکات کەسێک مەحکوم بە ئیعدام ببێ کە ڕیشم راوەشاند لە مەرگ رزگار دەبێ. گوتیان هونەری تۆ لە ئێمە چاکترە، خولاسە چوار بە چوار خەزێنەی شایان تالان کرد و بردیان لە جێیەک شاردیانەوە تا شەوی دوایی بچن رایگوێزن. خولاسە بەیانی کە شا دەچێتەوە بۆ بارەگای چەند نەفەر مەئموور دەنێری کە ئەو سێ نەفەرانە بگرن و بیانهێنن بۆ بارەگای شا عەبباس و خەزێنەکەش بێننەوە. ئەو کارە دەکەن و شا دەستوور دەدا کە ئیعدامیان کەن، ئەو نەفەرەی کە هوونەرەکەی ناسینەوەی هەر کەسێک لە تاریکەشەودا دەبێت روو لە شا دەکا و دەڵێ :

ما سه تن کردیم کار خویش را　　　ای به قربانت بجنبان ریــش را

واتە ئێمە کاری خۆمان کرد ئەوجا نۆبەی هونەری تۆیە و ڕیشت بجووڵێنە، شا عەبباس خەندەیەکی هاتێ و گوتی ئازاد بن.

دیارە وەفا بە عەهد زۆر باشە، هەرچەند کارەکەشیان خیلاف بووە و دەبوو تەمبێ بکرانایە بەڵام بە قەولی کوردی :

دز و خاوەن ماڵ گەر ببنە هاودەست　　　گـا لە رۆچنەوە دەردێنن بێ هەست

# .: بەشی ٧٤ :.

دەڵێن مەلایەک دەرسی بە منداڵێک دەگوت، منالەش بە هیچ رەوانی نەکرد، مەلا شولکێکی لێرادەکێشێ و منداڵەکە لە ترسان بایەکی لێ بەردەبێ. مەلا هێندەی دیش قەلس دەبێ و دەڵێ : هەتیوە ئەوە بە خوارێم جەواب دەدیەوە. دیارە قەدیم زۆر بە بێ روحمی لەسەر دەرس لە منداڵیان دەدا، کە نەدەبوو وابوویایە. بە خۆشحاڵیەوە ئێستا وانەماوە، هادی کورم دەڵێ : ئێستاش ئەگەر چاوم بە مامۆستای دەرسم دەکەوێ رقم لێهەڵدەستێ، چۆن وەختی خۆی زۆر بە بێروحمی لێیدەدام.

سەعدی دەڵێ :

چــو بــاد اندر شـکم پیچید فرو هــل　　　که باد اندر شکم باری اسـت بـر دل

واتە ئەگەر زگت بای کرد ڕەهای کە با بێتە دەر چونکە با لە زگی ئینساندا کوڵ و باری دڵە.
دەڵێن دوو نەفەر پێکەوە جەماعەتیان دابەست، مەلا دەست نوێژی زۆر گران بوو؛ زگی بای کردبوو، هەر قوورەقووڕی بوو، لەبەر ئەوە نوێژی چوار ڕەکەعاتی بە دوو ڕەکەعات تەواو کرد و سڵاوی دایەوە. ڕەفیقەکەی گوتی : خۆ دوو ڕەکەعاتت کردن، مەلا بە مەئمومەکەی گوت ئەوە بۆ ئاگادارت نەکردمەوە؟! گوتی : وەڵڵا من کە نوێژەکەم دابەست، دەستنوێژم گران بوو لە دەشتی هەولێری دەسووڕامەوە، مەلا گوتی درۆ دەکەی، خۆ منیش لەوێ بووم، دەردی تۆم بوو ئەی بۆ نەمدی.

# .: بەشی ٧٥ :.

دەڵێن کابرایەکی زۆرخۆر میوانی ماڵێک دەبێت، هەر نانی بۆ دێنن تێر ناخوا هەتا تەبەک خاڵی دەبێ لە نان. خانەخوێ لێی دەپرسێ خێرە کە هاتووی بۆ شار؟ دەڵێ : بۆ سەر دوکتۆری دەچم. خاوەن ماڵ دەڵێ ئەی خاکم بەسەر، ئەوە نەخۆشی ئەو هەمووەت خوارد ئەگەر ساغ بایەی چت دەکرد؟! بۆ خاتری خوا لەگەڕانەوەدا لێرە لامەدە. بەڕاستی زۆر خواردن بەڵایەکی زۆر گەورەیە و زۆربەی نەخۆشییەکان بە هۆی زۆرخۆرییەوە پەیدا دەبن، بە قەولی دوکتۆران : «قال بَعْضُ الْحُكماءِ اِنَّ اَكْثَرَ النَّاسِ يَحْفِرُونَ قُبُورَهُمْ بِأَسْنَانِهِمْ» واتە زۆربەی خەڵک بە هۆی زۆرخۆرییەوە قەبری خۆیان بە ددانان هەڵدەکەنن، کەوابێ ئینسان واباشە خۆی لە زۆرخۆری بپارێزێ، بە قەولی کوردی : ئەگەر کایەکەش ئیخوت نییە، کادینەکە ئیخۆتە.
دەڵێن مەلایەکی کوڵ ژنی هێنابوو لێی نەدەبوو بە زاوا، ڕەفیقێکی بە شۆخی بۆی نووسی :
لادە لادە لەم دۆڵە هەڵۆڵە ئەم کێوە ناکێڵدرێ بەم گاسنە کۆڵە
ئەویش بۆی دەنووسێ :
لانادەم لەم دەور و دۆڵە تیژم کردووە گاسنە کۆڵە
کابرایەک دەیگوت خێزانم منداڵی ببو، مامانەش گوتی دەبێ شەوارەی بۆ بگرن و ئاگاتان لێبێ دەنا شەوە دەیباتەوە. شەوانە لە ترسی شەوەی خەوم نەبوو، شەوێکیان لە نیوەشەودا هەر ئەوەندەم زانی مشکێک لە دیوەکەماندا پەیدا بوو، گوتم ئەوە شەوەیە و بە هەموو تاقەتی خۆم بیورێکم لێڕاکێشا، هۆڕەی هات خێزانم لەخەو ڕاپەڕی و گوتی : چ بوو؟ چ قەوما؟ گوتم :

شەوەم کوشت، ئەو جا هەموو ژنە زەوسیتانی دونیا بە ئەمینی لیی بنوون، هەر ئەو سەگباب خێوە بوو منداڵی دەبردنەوە.

بە داخەوە قەدیم ئەم شتانە زۆر بوون، ئەوە شەوەیە، ئەوە جنۆکەیە، ئەوە دێو و درنجە و ... بەو شتانە زۆر ژن و منداڵیان ترساندون و واهە بوو زۆر کەس بە هۆی ئەم خورافاتانەوە تووشی نەخۆشی رەوانی دەبوو. بە خۆشییەوە ئێستا خەڵک روون بۆتەوە و ئەو شتانە کەم بوونەوە.

# .: بەشی ٧٦ :.

دەڵێن کابرایەکی بەزاز هەبوو، عادەتی وابوو کە پارچەی دەپێوا، دەستی دەکێشا و میتر بازی دەکرد تا شەوێک لە خەویدا چەند نەفەر مەئمووری دەوڵەتی هاتن و گرتیان و بە پەلبەستوویی بردیان بۆ دەری شار و گوتیان ئێمە مونمووری دەولەتین و دەستوورمان پێیە لێرە بە تاوانی فرت و فێڵ و میتر بازی ئیعدامت بکەین. ئالایەک لەوێ هەڵدرابوو گوتیان تەماشا کە ئەوە ئەو ئالایە کە نموونەی هەموو ئەو پارچانەی کە لە مووشتەریت دزیون تێیدایە. کابرا کە تەماشا ئالایەکەی کرد دیتی کە شتەکە هەمووی راستە و ناتوانێ حاشا بکات. گوتی : ئەم سەفەرە لێم ببورن تۆبە دەکەم و جارێکی کە میتربازی ناکەمەوە و خەیانەت بە مووشتەریان ناکەم. گوتیان باشە، بەو مەرجە تیکراری نەکەیەوە ئەینا جارێکی کە بێچوون و چرا ئیعدامت دەکەین. لەم کەین و بەینەدا بوو لە خەو راپەری و گوتی خوایە هەر چەند خەون بوو بەڵام تۆبەم راستی بێ، بەیانی کە چۆ دوکان، خەونەکەی بۆ شاگردەکەی گێڕایەوە و گوتی لەم رۆ را تۆبەم کردووە، تۆش ئاگادار بە ئەگەر ویستم میتربازی بکەم ئاگادارم کەوە، شاگرد گوتی جا چۆن؟ خۆ لەکن موشتەری ناکرێ بڵێم فێڵێ مەکە، گوتی بەس بڵێ : ئالاکە، خۆم خەونەکەم وەبیر دێتەوە، هەتا دوو ساڵ میتر بازی نەکرد، تا رۆژێکیان پارچەیەکی دەپێوا دەستی کرد بە فرت و فێلان، شاگرد گوتی وەستا ئالا، وەستا ئالا، فایدەی نەبوو و میتر بازیەکەی هەر کرد و پارچەکەی بۆ موشتەری پێچایەوە و موشتەری رۆیی. شاگرد گوتی بێقەزا بی قەرار نەبوو ئەگەر گوتم ئالاکە تۆش خەونەکەت وەبیر بێتەوە و فێڵ نەکەی؟ ئەی بۆ هیچ گوێت نەدامێ، بەزازە گوتی وەڵڵا خۆم خەونەکەم لەبیر بوو بەڵام ئەو ئالایەی کە لە خەومدا دیتم لە هەموو نموونەیەکی پێوە بوو تەنیا لەم نموونەی ئەمڕۆ نەبێ، گوتم با نموونەی ئەو پارچەش لەگەڵ بێ.

دیارە ئینسان کە ویستی تۆبە بکات لە کاری خەراپ و فرت و فێڵ لەگەڵ خەڵکدا بکات دەبێ بە راستی بێ و پەرێزی خۆی بە راستی و دروستی خاوێن بکاتەوە بەڵام بە قەولی کوردی «خووی شیری، هەتا پیری»، «دەڵێن تۆبەی گورگی مەرگە»، ئەنیا سەد گوناە و یەک تۆبە، خۆزگە بەو کەسە کە ئەهلی فرت و فێڵ نییە، بە قەولی فارس دەڵێ :

هر چە کنی بە خود کنـی    گر همە نیک و بـد کنـی

# .: بەشی ٧٧ :.

دەڵێن کابرایەکی نۆکەر بە زۆری منداڵێکی پێ لە باوەش دەکەن. منداڵە لە کنی ژیر نەدەبوو و زیرەی دەچوو بۆ ئاسمان، هەر لە بنەوە لیی رەبادەدا و لە سەرەوە دەیلاواندەوە.

دیارە هەر کارێک لە رووی ئیختیار و ئارەزوو نەبێ بەکار نایەت بە قەولی کوردی : «کەچەڵ بە زۆر لەدار هەڵناڕوانێت.»

دەڵێن دەرویشێک بە شێخەکەی گوت : قوربان من زکری دەکەم، گەرمدانایەم، شێخ گوتی خەمێ مەخۆ گەرمت دادێنم. دەروێش گوتی هەی لەبەر ئاورە سوورەکەت مرم، خەریکە گەرم دادێم.

کابرایەک بۆی گێڕامەوە گوتی : زستان بوو تەنەکەیەکیان ئاوی گەرم و تەشتێکیان بۆ ساز کردم، چووم لە کادێنێ خەریکی حەمام کردن بووم، کە تەواو بووم خەریک بوو لیباسان لەبەر کەمەوە، هەر ئەوەندەم زانی لۆدە کایەکم بەسەر داهات، کە تەماشام کرد کوڕەکەم بوو، گوتم : ئەحمەق، ئەوە بۆ وات کرد؟ گوتی : ئەتۆ شەوێ دەچیە زگ دایکم و وای لێدەکەی، ئەمنیش ئاوات لێدەکەم... واتە ئاوت بەسەر دادەکەم.

بەهەرحاڵ قەدیمیان شۆخی و جەفەنگیان زۆر بووە بەڵام بوغز و غەرەزیان لەگەڵ یەک نەبووە و دڵ و دەروونیان وەکوو ئاوێنە بێگەرد و خاوێن بووە. خۆزگە ئێمەش لەگەڵ یەک ئاوا بووینایە، ئەوان هیچ کات خەیانەتیان بە گیان و ماڵ و نامووسی یەکتر نەکردووە و لە سەدی چوار خەراپ و پووچەڵیان نەبووە، هەر چەند لە باری ماڵییەوە خەڵک فەقیر بووە بەڵام لە باری مەعنەوی و ئەخلاق و ئولفەت و موحەببەتەوە تێر و تەسەل بوون و بە دەرد و مەرگی یەکترەوە ماندوو بوون، بۆ ژیانی دونیا وەکوو مامە خەمە نەبوون، لە شایی و لە شین حاڵەتی دەستە و هەرەوەزیان هەبووە و بە فیز و دەمار نەبوون و پیاوی دین و دونیا بوون، بوێر و ئازا بوون،

تەسلیمی زاڵم وملهوڕ نەبوون، خۆخۆر و بە فرت و فێڵ نەبوون. سەعدی دەڵێ : «نە طیبت حرام است و غیبت حلال»، واتە جەفەنگ و شۆخی حەرام نییە و غەیبەت حەرامە.

# .: بەشی ٧٨ :.

دەڵێن خانزادی سۆران کە ژنێکی زۆر دەوڵەمەند و رەئیس عەشیرە دەبێ شەوێکیان کە جومعە دەبێ، لە بن پەنجەرەی حوجرەی فەقێیان خۆ دەگرێ، فەقێیەکان هەر یەک ویست و ئاوات و ئارەزوویەکیان باس دەکرد؛ یەکێک لە فەقێکان دەیگوت : ئاواتی من ئەوەیە خۆزگە کە لە خوێندن دەبوومە خانزادی سۆران، کە ئافرەتێکی زۆر جوان و دەوڵەمەند و ژیرە. ژنە مێردی بە من بکردایە، گۆیا ئەو کاتە خانزادەخان بێوەژن بووە، خولاسە وەختێک کە فەقێ ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ، خانزادە خان لەدوو فەقێکە دەنێرێ. دەڵێ : مەلا، ئەمن دەمهەوێ شوو بە تۆ بکەم. فەقێ لە خۆشیان باوەڕ ناکات. دەڵێ : خانمی بەڕێز، ئەمن و ئەتۆیان نەگوتووە! خانزادی سۆران دەڵێ : دەمهەوێ ئاواتەکەت بێتە جێ. بە کورتی فەقێ بەمرادی خۆی دەگات. خوێنەری بەڕێز یادی خانزادی سۆرانم لە «گەشتی کوردستان»دا کردووە. سڵاو لە گیانی، بەڕاستی شێرە ژن بوو.

کابرایەک کە قسەی دەکردن یەکێتر قسەی لە نێوان قسەکاندا دەکرد.دەیگوت : تەورداسێم لە قسان مەدە، بە قەولی سەعدی :

سخن را سرست و ای غیرت مند بن  میـــاور ســـخن در میـــان ســـخن

دەڵێن ئەگەر موتالەعەت کرد یان گوێت لە قسە و وتار راگرت دەبێ بە تەڵ بیری ژیری و بیری لە کەوی دەی و دایبێژی، پوختە و پاڵاوتەکەی هەڵگری و چەوت و چەوێڵەکەشی وەلانێی.

ئیمامی عەلی لەو بارەوە دەڵێ :

أنْظُــر إلــی مــا قـــالْ  وَ لا تَنْظُر إلیَ منْ قالْ

# .: بەشی ٧٩ :.

دەڵێن کوڕێک بە بابی دەڵێ بابە ئەمن سەد دۆستم هەیە. باوکی دەڵێ رۆڵەم ئەتۆ زۆرت ماوە تا دۆستەکانت بناسی و بزانی کامەیان بە راستی دۆستتە، ئەمن ئەوە هەشتا ساڵم عومرە تەنیا هەر دۆستێکم هەیە. دوایی کابرا بۆ ئەوەی کوڕەکەی دۆستی نانی و زمانی و گیانی لێک کاتەوە، دێنێ بزنێک سەر دەبڕێ و دەیخاتە نێو جەواڵێکەوە و لەژێرخانێکدا دەیشارێتەوە، ئەو جا بە کوڕەکەی دەڵێ : کوڕم پیاوێکم لە دەست کوژراوە دەبێ هەرچی زووە تا رۆژ نەبۆتەوە فکرێکی بۆ بکەین، بچۆ بۆ لای دۆستەکانت پێیان بڵێ حاڵێکی وایە و بێن یارمەتیمان بدەن بیبەین لە دەر شار ژێرخاکی بکەین، ئەینا دەوڵەت بزانێ دەمانکوژێ. کوڕە خێرا هەڵات بۆ لای دۆستەکانی و یەک بە یەک قەزیەکەی بۆ گێڕانەوە و داوای یارمەتی لێکردن، خولاسە هەر یەک بە جۆرێک جەوابی دەدایەوە و دەیگوت هەر تۆم قەت نەناسیوە، برۆ لە کنم خەریکە بەدبەختم دەکەی. لەوەش خەراپتر راپۆرتیان لێدا کە فلانکەس زەلامێکی کوشتووە و دەیهەوێ ژێرخاکی کا. کوڕە با نائومێدی گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی و هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە کە هیچ کام لە دۆستەکانی بە هاواریەوە نەهاتوون؛ باوکی گوتی : رۆڵە تینە برۆ بۆ لای فلانکەسی دۆستم هەتا رۆژ نەبۆتەوە ئەینا بەربەڵا دەبین. کوڕە بە پەلە خۆی گەیاندە لای دۆستی باوکی و قەیرانی لەگەڵ باس کرد و کابرا خێرا بێ ئەوەی بپرسێ چۆن و بۆچی خۆی گەیاندە ماڵی کابرا و گوتی کوا جەنازەکە، زوو وەکۆڵێم دەن با بیبەم ژێرخاکی کەم، لە کوێیە؟ سوتفە لە بن دەرکێ تووشیان لە مەئمووری دەوڵەت کەوت، سەخت گرتیانن و گوتیان ئەو زەلامەتان بۆ کوشتووە؟ ئێوە هەر سێکتان قاتڵن، کابرای ساحەبماڵ گوتی ئەوە بزنە سەرم بڕیوە و زەلام نییە و خێرا سەری جەواڵەکەی بۆ کردنەوە. مەئموورەکان سەریان سوورما، گوتیان ئەمە چ نەقشەیەک بوو؟!! کابرا شەرحە حاڵی سەد دۆستەکانی کوڕەکەی و فێڵەکەی و تاقەدۆستەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە، زۆریان پێخۆشبوو و گوتیان هەر ئەو دۆستانەش راپۆرتیان داوە. ئەو جا کابرا رووی لە کوڕەکەی کرد و گوتی : رۆڵەم ئەو جار بۆت دەرکەوت کە هیچیان دۆستی گیانی نەبوون، بەڵکوو هەموویان دۆستی نانی و زمانی بوون و بە هەمووان بە دۆستەکەی من نەبوون.

لەم نەقڵە دەبێ گەنجەکان دەرسی دۆستناسی بە قەولی کوردی : «هەرچی سمێڵی سوور بوون، هەمزاغا نییە ... »، سەعدی دەڵێ :

دوست مشمار آنکە در نعمت زند لاف یاری و برادر خواندگی
دوست آن باشد کە گیرد دست دوست در پریشان حالی و درماندگی

بە جێیە بۆ زیاتر روونبوونەوەی مەتڵەب نەقڵی ئیبنوموقلەش بە شیعر وەگێڕین:

تَحالَفَ النّاسُ وَ الزَّمانُ فَحَیْثُ کانَ الزَّمانُ کانوا
عادانِیَ الدَّهرُ نِصْفَ یَوم فَانْکَشَفَ النّاسُ لی وَ بانوا

(ابن مقلە)

ناقڵێک لە مێژوو لە مێژ و جوانە
ئەم قاڵ و باسە بکەینە وانە
لە ئیبنوموقلەی بە بیر و هۆزان
وا دەگێڕنەوە بۆ گەل و هۆزان
دەڵێن مەقام و پلەی بەرز بوو
لای فەرد و کۆمەڵ خاوەن ئەرز بوو
پیاوێکی خەتخۆش زۆر بەختەوەر بوو
باش و بە کەڵکی ناو جەماوەر بوو
لە لای دەوڵەتیش زۆر بە ئیکرام بوو
بە قەدر وڕێز و خاوەن مەرام بوو
ناحەزەکانی ئێرەیان پێ برد
هەر بەو داخەوە ئیبنوموقلەم مرد
خەتا باریان کرد بە گوناه و تاوان
دیارە ناحەزان هەمیشە ئاوان
دەوڵەت بێ ئەوەی لە کەس بپرسێ
لای برد لە سەر کار بە بێ مەترسی
سەرەڕای ئەوەش دەستیشی بڕی
پیرۆزەی بەختی لەسەر شان فڕی
واتە ئەو دەستەی کە پێی دەنووسی
بڕا و لە کەڕ بوو واتە پێنووسی

نــەما مــەقام و دەســت و پەنجەکــەی
نەهاتــە فریــای مــاڵ و گەنجەکــەی
دەوری لێگــۆڕا و خانــەنشــین بــوو
خەم خەمی کـرد و ژینـی لـە ژیـن بـوو
کەس لێی نەپرسی لە دۆست و ئەحباب
بــە پێچەوانــەی زەمــانی ئــەڕباب
بە موناسبەی خۆی،چەند جوانی فەرموو
لـەم پەنـدە جوانـە لا مـەدەن بـە مـوو
گوتی سوێندخۆرن واتە چەرخ و گـەل
ئەوەی هاتە گەڕ لە بـۆی کـات و هـەل
لـە دەوری هـاڵێن ڕێـزی لـێ بگـرن
گـوێ لـە مستی بـن گـەر بڵـێ بمـرن
زەمانــە نیــو ڕۆژ گــەڕا بــە دوژمــن
دونیـای بـە سـجن گـۆڕی لـە بـۆ مـن
ئـەو کاتـە زانـیم کـە چۆنـە خـەڵک
واتــە بێوەفــا و ســپڵە و بــێ کــەڵک
تــا لەگــەڕ دابــوو ئەســتێرەی بــەختم
لـە دەورم داڵان وەخـت و بـێ وەخـتم
کــە بــەختم نــەما کەسیشــم نــەما
جێگام پێلـەنگ بـوو لـە ئـەرز و سـەما
بــەڵێ هــەر وایــە گــەل بــێ وەفایــە
لـە دەورت داڵـێن تـا هـەی لـە کایـە
بەڵام کە زانی پاش نوێژێ دەوڵەت
بــۆی گێڕامــەوە مــەقام و ســەروەت
خــەڵک کــە زانــی هاتــەوە هــاتم
بــە پــوڵ هــاتن بــۆ مولاقــاتم

دەسـت لەسـەر سـینە چلـۆنی قوربـان
بـە قوربانـت بـێ سـەروەت و کوڕمان
لـە بـۆم دەرکـەوت کـە دۆسـتی نـانین
هـەروا زمـانین نـەک دۆسـتی گیـانین
«ئـەمین» ئـەو کەسـەی دۆسـتی نانییـە
بـە هیچـی بگـرە مـەڵێ وا نییـە
بـەڵام ئـەو کەسـەی دۆسـتی گیانییـە
بـە قـەدر و ڕێـزە پـووش و گیـا نییـە

# .: بەشی ٨٠ :.

دەڵێن جارێک شەیتان بە موسای گوت : عەرزی خوا بکە لە خەتا و تاوانم ببورێ. گوتی زۆر باشە، موسا عەرزی خوا دەکا و خوا دەفەرمێ زۆر باشە، پێی بڵێ ئەمن کاتی خۆی پێمگوت سوجدە بۆ ئادەم بەرە بە قسەی نەکردم لەبەر ئەوە لە ڕەحمەتی خۆم بەری کرد، ئێستاش ئەوە قەبرەکەی لە فلان جێیە، بچێ سوجدەی بۆ بەرێ لێی خۆش دەبم. موسا کە گەڕایەوە بە شەیتانی گوت : مژدەیەکی خۆشم پێیە بۆت، خوا ئاوای فەرمووە. شەیتان گوتی : جا ئەمن بە زیندوویی سوجدەم بۆ ئادەم نەبردووە، ئێستا کە مردووە سوجدەی بۆ دەبەم!

کابرایەک لە خەویدا شەیتان دەبینێ کە زۆر جوان بوو گوتی : تۆ کێی؟! گوتی من شەیتانم، کابرا دەڵێ خۆ من هەیکەلێکی تۆم لە بەر دەرکی حەمامێک دیوە زۆر ناحەز بوو کەچی ئەتۆ ئاوا جوانی. گوتی : قەڵەم بەدەست دوژمنە، بە ئارەزووی خۆی ناحەزم دەکێشێتەوە.

دەڵێن حاجیەک لە حەج خەریکی بەردە بارانی شەیتان بوو، شەیتان پێی گوت فلانکەس ئەوە تۆش بەردە بارانم دەکەی؟ خۆ ئێمە بەینمان خۆشە پێکەوە، حاجی گوتی : ئەوە لەبەر خەڵکی مەجبوورم ئەینا هەر لەگەڵ تۆم و لە قسەت دەرناچم، تۆ برا گەورە و من برا چووکە.

دەڵێن سەعدی بەلای حاجیەکی خەراپ و فێڵەبازدا ڕۆیشت و گوتی : ئەتۆ حاجی نی، وشتر حاجیە چونکە بێچارە چەقلان دەخوا و باری دەبا :

حـاجی تـو نیسـتی، شـتر اسـت حـاجی
از برای آنکه بیچاره خار می‌خورد و بار می‌برد

دەڵێن حاجیەکی فێڵەباز دوو تمەنیەکی لەنێو کەشیدەکەی هاویشتبوو؛ وەختێک شتی دەفرۆشت سوێندی دەخوارد کە : بەو کەشیدەی دوو تمەنی تێدایە و بەو فێڵە کابرای دەبڕیەوە.

بۆ خۆم ئەو ساڵە کە چووم بۆحەج، حاجیەکمان لەگەڵ بوو کە لە وێ دزی لێ واقیع بوو، هەروەها حاجیەکی زۆر شەڕانی و نارەسەنی کەشمان لەگەڵ بوو کە قەڵس دەبوو، دەیگوت لێرە دەنگێ ناکەم مەگەر نەگەینەوە سەردەشتێ، بەڵام کە هاتینەوە زۆری نەخایاند بە رەحمەتی خوا چوو. بە راستی ئەوانە حاجی نین، عاجین. ئەوەیە کە شێخ رەزا دەڵێ :

کەر بـە حـەج نـابێ بـە حـاجی

هـەر وەکـوو خـۆی سـم خـرە

خۆزگە بەو کەسە کە لە دوا مردنی دەبێتە سەرمەشق و نموونەی چاکی و پاکی بۆ وچەی دوای خۆی.

شێخی سەعدی دەڵێ کابرایەکی هەژار چوو بۆ ماڵی دەوڵەمەندێک، داوای یارمەتی لێکرد. کابرای دەوڵەمەند بە قەڵس و تورەیی وەدەرێینا و یارمەتی نەکرد. کابرای فەقیر بە نائومێدی گەڕایەوە. دوای چەند ساڵێک کابرای دەوڵەمەند مایە پووچە و فەقیر بوو و کابرای هەژاریش دەوڵەمەند بوو. کابرای دەوڵەمەند کە هەژار ببو ناچار وە سواڵی کەوت. چوو بۆ ماڵی هەمان کابرای فەقیر کە دەوڵەمەند ببو. بێ ئەوەی بیناسێتەوە چوو بۆ لای و داوای یارمەتی لێکرد. پارەیەکی زۆری دایە و پێی گوت : ئەرێ دەمناسیەوە؟ گوتی : نەخێر. گوتی : ئەمن هەمان هەژارەکەم کە چەند ساڵ لەمەوبەر فەقیر بووم، هاتم بۆ لات یارمەتیت نەکردم و بە قەڵسیەوە وەدەرێت کردم. کابرا لە کردەوەی خۆی زۆر پەشیمان بۆوە و خەجاڵەتی نەبێ پێی نەما. بەڵێ، ئەوزاع و ئەحواڵی زەمانە ئاوایە؛ هەردەم بە جۆرێکە. کەوابوو پیاو نابێ بە سەروەت و سامان خۆی لێبگۆڕێ و دەستی هەژاران نەگرێتەوە.

# .: بەشی ٨١ :.

ساڵی ١٣٣٤ی هەتاوی لە گوندی گرویس پۆلێک منداڵ پێکەوە شوان بووین لە شاخی قەڵاتی، تووشمان لە ڕێویەک کەوت و کەوتینە سەری، هەڵەمێ و هەڵەوێ بە کاوە شاخێکەوە خۆی حەشاردا. نەوێراین بۆی بچین لەبەر هەڵدێری، تەسادوف لەو کاتەدا مەلا ئاوارەی شڵماشی پەیدا بوو، زۆر شاخەوان بوو، چوو ڕێویەکەی هەڵداشتە خوارێ و ئێمەش ڕێویەمان

گرت و دادگای سەحراییمان بۆ ساز دا و گوتمان ئەی ڕێوی بە فرت و فێڵ! زۆرت مریشک و قاز و مراوی لێ خواردووین، ئێستا تۆڵەی هەموو ئەوانەت لێدەکەینەوە و ڕێویمان لەوێ کوشت. بەڵێ سێ ساڵ بە منداڵی شوان بووم، خێزانیشم ئەو کاتە لەگەڵ من شوان بوو، بە شۆخی پێم گوت : کۆڵوانە گازری ، ڕاستی هەر بە منداڵی حەزم لێدەکرد، چارەنووس کە گەورە بووین بە تەواوی بوینە هاوەڵی ژیانی و هاوسەر و هاوسەنگەری تاڵی و شیرینی ژیان و بە تەبایی و خۆشی تا ئێستا پێکەوە ژین و ژیوار بەسەر دەبەین، سێ کوڕمان بە ناوی : هادی، مهدی و ئازاد و دوو کچ بە ناوی : فەریدە و ناسکەمان هەن، خوا یار و یاوەرمان بێت و تەمەن درێژ بن. لە بەهەشتی کوردستاندا وەسیەتم کردووە کە هەموو ساڵێک لە مانگی گوڵاندا بێنە سەر گۆڕەکەم.

ئەمین ئومێدی بە ڕۆڵەی ژیرە لـەدوا مـردنیش منـی لـەبیرە

خولاسە منداڵ بووین و شوانی کارەگەل و بێخەم و پەژارەی دونیا و پووڵ و پارەمان نەبوو، هەور دەینالاند، ئەم شیعرە بە دەنگی بەرز دەگوتەوە :

هـــــەور دەنــــــاڵێنن شـــــوانان دەترســــێنن پڕ بە ڕانکـەیان دەڕێـنن

سوتفەن ئێستا کە ئەم پەڕتووکە و بیرەوەریانە دەنووسمەوە وەرزی بەهاری ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی و مانگی گوڵانە، باران بە لێزمە دەبارێ و هەور دەگرمێنن، سێلاو هەڵستاون و تاڤگە و ڕووباران بەهارە و هاژە دێنە خوار و لە خڕ و دۆڵان هەڵدەڕژێن، خەم و پەژارە لەسەر دڵان لادەبەن و گوڵاڵەی چیا بەرزەکان دەکەن بە دیاری بۆ کوڕ و کچان، شنەی شەماڵ دڵی دڵداران باوەشێن دەکات و نەغمەی مەلان و قاسپەی کەوان دەبنە بلاوێن بۆ دایکانی جگەر سووتاو و باوکانی پشت شکاو لەتاو ڕۆڵەی لە خوێن گەوزاو بۆ گەل و نیشتمان.

## .: بەشی ٨٢ :.

دەڵێن ڕێویەک لە چۆلگەیەک دەگەڕا، کەڵەبابێک چاوی پێدەکەوێ و دەست دەکا بە خوێندن. ڕێوی پەلاماری دەدا و بە دەمیەوە دەیگرێ و هەڵدێ، ڕێوی لە بیری چۆوە کە کەڵەشێری بە دەمەوەیە، زاری هەڵپچڕی کە واق واق بکا، کەڵەشێرەی لە دم بەربۆوە، کەڵەشێرە لە چنگانی هەڵات و لەسەر قەدەدارێکی بڵند هەڵنیشت. ڕێوی بە حەسرەتەوە تەماشای کرد و

گوتی : ئای چۆنم لە کیس خۆ دای، کەڵەشێرە گوتی : ئەو دەنووکە بشکێ کە بێوەخت دەخوێنێ و ئەو دەمەش بە بڕین چێ کە بێوەخت هەڵدەپچڕێ بۆ قسە کردن.

لەم نەقڵەدا ئەوەمان دێتە دەست کە دەبێ ئینسان ئاگای لە دەمی خۆی بێ و بێوەخت قسان نەکا و فکر کاتەوە لەو قسەی کە دەیهەوێ بیکا و بزانێ کۆی چ قسەیەک هەڵدەگرێ و کوێ چ قسەیەک هەڵناگرێ.

دەڵێن جارێک ئیمامی شافیعی لەگەڵ چەند برادەرێک چوون بۆ سەحرا بۆ ئیستراحەت، دوو مریشکی سوورکراوەیان پێ دەبن، نیوەڕۆ کە ویستیان نان بخۆن مریشکەکەیان لەسەر کەوڵێک دانان و بە خۆیان نەزانی ڕێویەک لەپڕ داهاتە مریشکەکان و یەکیانی هەڵگرت وهەڵات. هەموویان کەوتنە دوای ڕێوی کە مریشکەکەی لێ بستێننەوە کەچی هیچیان بە هێچ نەکرد، بە دەستی خاڵی گەڕانەوە بۆ جێی خۆیان. لە دوورڕا دیتیان ئەوە ڕێویەکە دووبارە هاتۆتەوە و مریشکەکەی دیکەشی بە دەمەوە گرتووە و بێ گۆشت مانەوە. ئەمەش فرت و فێڵی ڕێوی.

دەڵێن کابرایەک چۆلەکەیەکی گرتبوو، چۆلەکەکە گوتی بەرمهەڵدە دوو ئامۆژگاری و خەبەرێکی خۆشت پێدەدەم. کابرا بەری هەڵدا، چۆلەکە گوتی یەکەم ئامۆژگاری : قەت خەفەت بۆ شتی لە دەستچوو مەخۆ، دووهەم ئامۆژگاری قەت باوەڕ بە شتی مەحاڵ مەکە. خەبەرەکەش ئەوە بوو من دوو کیلۆم زێڕ لە لەش دایە، کە وایگوت کابرا دەستی کرد بە حەول و تەقەللا بۆ ئەوەی بە قسەی خۆش چۆلەکەکە بگرێ و دوو کیلۆ زێڕەکە وەدەست بێنێ، چۆلەکەکە پێی گوت ئاخر نەسیحەتم نەکردی کە خەفەت بۆ شتی لە دەست چوو مەخۆ و مەحاڵ باوەڕ مەکە، ئاخر من بەم چوکەڵەییە چۆن دەتوانم جێگای دوو کیلۆی زێڕ وەبم؟!!

کە واتە ئینسان دەبێ خۆڕاگر بێ لە بەرامبەر لەدەستدانی هەر شتێک. خۆشەویستی، ماڵی دونیا بێ و یا خود هەر زەرەر و زیانێکی کە بێ و ڕازی بە قەزا بێ، ئەگەر ماڵی دونیای لەدەستدا زۆر فکری لێ نەکاتەوە و بە خەم و خەفەتان خۆی نەکوژێ. کابرای کاسب تووشی زەرەر و قازانج دەبێ، دەبێ کۆڵنەدەر و تێکۆشەر بێ، ئەگەر سەر سەلامەت بێ زەرەر و زیان قەرەبوو دەکرێتەوە.

چلکی دەستە ماڵی دونیا وەک دەڵێن      ماڵپەرەست پەیمان شکێن و بێ بەڵێن

بە ڕەحمەتبێ شێخ عەبدوڕڕەئوف نەقشبەندی بە شۆخی ئەم شیعرەی گۆڕیبوو بە :

چلکی دەستە ماڵی دونیا وەک دەڵێن      خۆزگە قەت بۆ چلکی دەستت پێ نەڵێن

هەروەها ئینسان دەبێ هەموو شتێک بە مەحەکی عەقڵی خۆی هەڵسەنگێنێ و باوەڕ بە هەموو شتێکی مەحاڵ نەکا، زۆر کەس بە خەیاڵ پڵاو دەچن مل لە کێوێک دەنێن، هەڵی دەدڕن بۆ غەزنە و کەچی ماندوو بوون و حەسرەت نەبێ بۆیان نامێنێتەوە.

# .: بەشی ٨٣ :.

دەڵێن کابرایەک بە دۆڵمان قەڵس دەبێ، دوو سێ نەفەر جەفەنگباز دەچن بۆ لای دەیانهەوێ بە فێڵ قەڵسی کەن. یەکیان دەڵێ بەهاران خۆشە کە وڵات سەوز دەبێ، مێو گەڵای تازە دەردەکەن، دووهەمی دەڵێ : جا پەلکەمێوە جوان و تازەکان لێدەکەنەوە، سێهەمی دەڵێ : جا برینج و پیواز و رۆن و بەهاراتی تێکەڵ دەکەن. دەڵێ کابرا وردە وردە لە فیتی خۆی حاڵی ببوو، هەستایە پێ و گوتی : جا ئەگەر پیاوی وەپێیچە، وەڵڵا نەوەندەت تێهەڵدەدەم کە رۆژی شاییە هێندە لە دەهۆڵی هەڵنەدرابێ.

جەوانێک دەیهەویست بەزۆر لەگەڵ ئافرەتێک دەست تێکەڵاوی بکات. ئافرەت زۆر داوێنپاک بوو. ئامۆژگاری گەنجەکەی کرد و گوتی : ئەدەب و ئەخلاقت ریعایەت کە. کوڕەکە زۆر خەجاڵەت بۆوە و گوتی مەرج بێ لێرە بە دواوە خۆم تووشی ئەم کارانە ناکەمەوە. بەڕاستی پیاوی گەنج ئەگەر ئاگای لەخۆ نەبێ غەریزەی جنسی زۆر بە ئاسانی دەیخاتە ژێر فشار و تووشی کاری خەراپ و بێ ئەخلاقی دەکا. مرۆڤ دەبێ بە ئەخلاقی جوانی خۆی لە داوێن پیسی و دەستدرێژی بۆ ماڵ و نامووسی خەڵک خۆی بپارێزێ کە ئەگەر وای کرد، جگە لەوە کە بۆ هەمیشە لە کن خۆی و بنەماڵە و ئیجتیماعەوە سەربەرز و داوێنپاکە، دوور دەبێتەوە لە زۆر موشکیلات و نەخۆشیەکانی وەک ئیدز و ... کە بە هۆی تێکەڵاوی و نزیکی ژن و پیاو زۆر بە ئاسانی راگوێز دەبێ بە دوور وسەلامەت دەبن.

# .: بەشی ٨٤ :.

ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی بارێکم هەناری گرویس برد بۆ شاری نەغەدە و بە گەنم گۆڕیمەوە. دوازدە رۆژم پێچوون جا گەیشتمەوە ماڵێ، مەگەر خوا بزانێ چەندەم تاڵی و

سوێری چێشتن. هەروەها ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی بارێکم کاڵەکی کوڵوێ بردن بۆ بێوران هەتا ئێواری هاوارم کرد : کاڵەک بە گەنم، یەک کەس بە هاوارمەوە نەهات. ئێواری کاڵەکی سەگباب خێو ئاویان لەبەر دەڕۆیی و تلیسابوونەوە، ناچار هەڵمڕشتن و لێی سوار بووم بەرەو ماڵ. خەڵکی ئەو وەختە ئاوا فەقیر بووە بە دوو دێیان بارێکیان کاڵەک بۆ نەکڕاوە، ئێستا هەر ئەو بێورانە ئەگەر یەک ماشێن کاڵەکی بۆ بەری ناکەوێتە ئێواری. یان ئەوە بوو دەچووم لە چۆمی کەڵوێ بە گوێدرێژی خێزم دێنا بۆ سەردەشت جا لە هەورازی داربڕان یا لە خرێ کەرتڕێنێ کەرەکەم لێدەکەوت و دەوەستا. جارێک لەسەر پردی کەڵوێ قەرەچی ئەمبەراوبەری پردەکە تاولیان هەڵدابوو، منیش لەنێوقەدی پردەکە کەرەکەم لەگەڵ کەری قەرەچیەکان ملیان لێکنا، گوێدرێژی قەرەچییەکان پیرێژنە قەرەجێکی سوار ببو، گوێدرێژەکەی من ئازاتر بوو لە پیرێژنەی بە خۆ و توولەسەگی باوەشیەوە هەڵدایە خواری و پیرێژن دەستی کرد بە جنێودان و هات و هاوار، نەمزانی چۆن خۆم لەو گۆنگەڵە دەرباز کرد و خەلاس بووم. بەڵێ قەدیم ئاوا بە فەقیری و هەژاری ژیانم بەسەر بردووە.

جارێک لەگەڵ مامۆستا شێخ رەئووف باسی زەمانی رابردوومان دەکرد، گوتم ئەوەی راستی بێ قەدیم دونیا دۆزەخ بووە و ئێستا دوونیا بەهەشتە، کەوابوو ئێمە نیوەی تەمەنمان لە جەهەندەمدا براوەتەوە و نیوەشمان کەوتۆتە بەهەشت، بەڵام گەنجەکان ئەمڕۆ هەموو ژیانیان کەوتۆتە بەهەشتەوە، مامۆستا زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی فلانی ژیانی ئێمە خۆشترە چونکە ئەوان جەهەندەمەکەیان نەدیوە بۆیە قەدری ئەو بەهەشتەی کە ئێستا تێیدان نایزانن، گوتم ئەوەش راستە. ئەم نەقڵە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی لە دوکان لە خزمەت ئوستادی بەڕێزم خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ عەبدوڕڕەئووف نەقشبەندی (بێژوەیی) دانیشتبووم، بەڕاستی ئەو مامۆستا بەڕێزە بۆ من هاودەمێکی زۆر خۆش و زۆر رەفیقێکی دڵسۆز و زانا و ئەدیب بوو، ئیستیفادەی مەعنەویم زۆر لێکرد و خولاسە باوکی زانیاری و ئەدەبی من بوو. لەدوا بەڕەحمەت چوونی من زۆر غەریب بووم، هەرچەند دۆست و برادەرم زۆر بوون بەڵام کەس نەیتوانی کەلێنی ئەوم بۆ پڕ کاتەوە، با ئەوەش بڵێین کە ئەم زانا و بلیمەتە ٤٠ پەرتووکی باش و بەکەڵکی هەن کە بە داخەوە ئەجەل مەودای نەدا لە چاپیان بدا. هیوادارم کەسێک هەبێ قۆڵی هیممەتیان لێ هەڵکا و چاپیان بکا، بە رەحمەت بێ زۆرجار دەیگوت فلانی نووسەر ئینشای لەسەرە و دەوڵەمەندیش ئیفشا بەڵام بە داخەوە دەوڵەمەندەکان ئەو ئەرکە گەورە بەڕێوە نابەن، لەبەر ئەوە زۆربەی بەرهەمی زاناکان دەبنە خۆراکی سیسرە و مشک یا ئەوەی کە فڕێ دەدرێن و دەفەوتێن. جارێکیان لەگەڵ ئەو بەڕێزە لە گوندی بێژوێڕا شەڕە شێعرمان کرد تا سەردەشت،

هیچمان نەبەزین. قەدیم شەڕە شیعر زۆر باو بوو بەڵام بە داخەوە ئێستا خەڵک زەوق و حەوسەلەی لەسەر ئەم لایەنانە نەماوە.

ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی لە نزیک گوندی چەکۆ ئەو زانا و بەڕێزە لەگەڵ چەند ڕەفیقێک لە مینووبووسێک دابوون، هەزار مەخابن ماشێن هەڵدێرا و کەوتنە ناو چۆم و کۆچی دوایی کرد.

چەکۆ بوو ئێمەی کـردە مـەکۆی خـەم     پشتی چەند کەسی بە خەم کرد بە خـەم

# .: بەشی ٨٥ :.

دەڵێن کابرایەکی یەک تەن دروێنەی بەسەردا مابۆوە، کچەکەی کە زۆر جوان دەبێ دەڵێ : بابە بچۆ بە تەواوی کوڕی ئاوایی بڵێ سبەینێ هەرەوەزە، دروێنەمە، لەبەر خاتری من هەموویان دێن. کابرا چوو بە تەواوی گەنجی دێی گوت و دوارۆژ هەموویان هاتن. بەیانی کچەکە بەدزی و پەنامەکی یەکەیەکە جەوانەکانی دەبردە قوژبنێک و سێوێکی دەدایە و دەیگوت لە باخەڵی هاوێ ئەمن ئەتۆم زۆر خۆش دەوێ بەڵام با ئەوانی دیکە نەزانن. خولاسە کوڕ و کاڵ ملیان لە دروێنە نا، ئاوریان لە داسان دەبۆوە، کچەکەش جار جار دەچوو دیاریان و دەیگوت سێو لە باخەڵم گیان، بەو قسە ئەو جەوانانە ئاوریان دەگرت و دەبوو بە کێبەرکێ، بوو بە ئێوارە و جەوان تەقەیان لە دروێنە هەڵستاند، جوانەکان کە دەڕۆیشتنەوە خۆ بە خۆ بە یەکتریان دەگوت مردووت مرێ ئەمن سێوی دابوومێ و حەزم لێدەکرد، ئەتۆ بۆچی ئاوا خۆت دەکوشت، کە تەماشایان کرد ئەو فێڵەی لە هەمووان کردبوو.

دەڵێن کابرایەک مەڕێک لە پەتێک دەخا و دەیبا بۆ بازار بیفرۆشێ، مەڕەکە بە دوو خۆیدا رادەکێشێ و دەست دەکا بە هاوار کردن، ئاگای لە پشت خۆی نابێ. کابرایەک پەتەکە هەڵدەبڕێ و مەڕەکەی لێ دەدزێ. کابرا هەر هاوار دەکا، موشتەری ئەو مەڕە، کابرایە پێی دەڵێ ئەرێ ئەوە شێت بووی ئەو لەتکە پەتە بەدوو خۆتدا رادەکێشی و هاوار دەکەی. کابرا کە بە خۆی دەزانێ دەست دەکا بە هات و هاوار و گەڕان بە دوو مەڕەکەدا. کابرایەکی ساختەچی کە بانگی دەکا و دەڵێ تازە لە دوو چوان مەچۆ، وەرە من دووسەد دینارم لێ لەو چاڵاوە کەوتووە بۆم دەرهێنەوە پەنجا دیناری بۆ تۆ. کابرا دەڵێ زۆر باشە، خۆ مەڕەکەم بایی دە دینار بوو ئاوا قەرەبووی ئەو زەرەدەشم دەکەمەوە، خولاسە خۆی رووتدەکاتەوە و دەچێتە ناو چاڵاو و هەرچی دەگەڕێ هیچ نابینێتەوە، کە دێتەوە دەر دەبینێ کابرا رۆیشتووە و هەموو لیباسەکانی لێ

دزیوە، بە رووت و قووتی دارێک بە دەوری خۆیدا هەڵدەسووڕێنێ، کابرایەک دەڵێ خاڵە ئەوە بۆ وادەکەی و ئاوا بە دەوری خۆتدا هەڵدەسووڕێی؟! دەڵێ قاڵ و باسێکی وام لێ بەسەر هاتووە، بۆیە وادەکەم هەتا خۆشم نەدزن.

دیارە ئینسانی ساویلکە و فەقیرحاڵ قەدیم زۆر بوون، تەنانەت ئێستاش کەمتاکورتێک هەرهەن، بەڵام فێڵبازەکانی ئەمڕۆ لە هی قەدیم بیرەزاترن و نەهەنگی بە ساغی قووت دەدەن؛ کەوابوو خۆش بە حاڵی ئەو کەسە کە ئەمڕۆ فێڵی سەر فێڵی ساختەچی و فێڵبازەکان دەکەوێ و ناکەوێتەوە داو و تەڵەیان.

# .: بەشی ۸۶ :.

مەولانای روومی دەڵێ : کابرایەک تووتیەکی هەبوو پێی گوت : ئەی تووتی دەچم بۆ هیندوستان، چت بە دیاری بۆ بێنم؟ تووتی گوتی : وەڵڵا سڵاوی من بە تووتیەکانی وێ بگەیەنە و بڵێ فلانی گووتوویەتی خۆزگە بە حاڵی ئێوە کە ئازادن و بە کەیفی خۆتان ژیان دەبەنە سەر. کابرای بازەرگان کە گەیشتە هیندوستان، دیتی تووتیەک لە چەمەنزارێکی سەرسەوزدا خەریکی سەفا و هەڵفڕین و خوێندنە. بانگی کرد و وڵامی تووتیەکەی پێ راگەیاند، تووتی کە ئەوەی بیست خۆی بەلا داخست و مندار بۆوە. کابرای بازرگان زۆری پێ سەیر و ناخۆش بوو. بەهەرحاڵ کە گەڕایەوە بۆ ماڵ، نەقڵی تووتی هیندوستانی بۆ تووتی ناو قەفەس گێڕایەوە و تووتی دەست بەجێ خۆی بەلاداخست و مندار بۆوە، کابرا کە ئەوەی دی زۆری خەمی تووتیەکەی بوو، گوتی بریا ئەم نەقڵەم بۆ نەگێڕاباوە، تووتیەکەی لە قەفەس دەرهێنا و بردی لە دوور فڕێیدا، کابرا کە تۆزێک دوور کەوتەوە، تووتی راست بۆوە و چوو لەسەر لقی دارێک هەڵنیشت. کابرای بازەرگان کە ئەم حاڵەی دی هێندەی کە سەری سووڕما و گوتی دەبێ لەم قاڵ و باسە روونم کەیەوە، تووتی گوتی : تووتیەکەی هیندوستان، منی ئاگادار کردەوە کە ئەی تووتی تۆش بە فێڵ خۆت بمرێنە تا ساحەبەکەت فڕێتدا و لە زیندانی قەفەس رزگاریت بێت.

ئینسان دەبێ بۆ رزگاری خۆی و هاونەوعەکانی هەوڵ بدا و بەهەر فێڵ و فووتێک بێ خۆی و گەلەکەی رزگار بکات لە دەست زاڵم و ملهوڕان.

دەڵێن چوار برا لەسەر میراتی باوکیان لێیان بوو بە شەڕ و دەمە تەقە، لەو ئەسنایەدا کە گوێیان هەڵخست ئەوە چەند دز هاتبوونە سەریان و خەریکبوون ماڵیان لێ تاڵان دەکردن. خۆ

بە خۆ گوتیان با کێشەی نێوانمان وەلانێین و چارەی دزان بکەین و نەهێلین هیچ بدزن و دەرباز بن و دەرفەت لە ناکۆکی نێوانمان بەرن؛ دوایی کات زۆرە بۆ میرات بەشکردن، ئەگەر دز نەیبەن بە تالان.

ئەوەیە کە گووتوویانە : برا لە لای برا بێ، مەگەر قەزا لەلای خودا بێ. بێگومان ئەگەر خەلکی هەر ولاتێک بۆ یەک و لەگەل یەکبن، دوو بەرەکی وەلانێن و یەکگرتوو بن لە پێناو خاک و گیان و نامووسی خۆیان و گەلەکەیان، هیچ دوژمنێک ناتوانێ بەسەریاندا زالبێ و زەفەریان لێ ببینێ، کەوابوو یەک چل بن وەک شیلان چلچل مەبن، دەلێن : مەڕێک کە لە مێگەلی هەلبڕا، دەبێتە خۆراکی گورگ.

# .: بەشی ٨٧ :.

دەلێن کابرایەکی گەورە چوو بۆ مالێک، ژنی ئەو مالە کە مەشهوور بوو بەژنێک کە بێگاریێ بە هەموو کەسێک دەکا لەو کاتەدا خەریکی هەویرشێلان دەبێ و کە گوێی لە تەقەی دەرگا دەبێ دەلێ هەر کەسێک هەی، گۆزێکم ئاو لەگەل خۆت بۆ بێنە. کە کابرا گۆزە ئاوەکەی بۆ دێنێ پیرێژن هەر کە چاوی پێدەکەوێ دەلێ : هەی خەجالەت خۆم، نەمزانی کە جەنابتانن، بە خودای دەیبەیەوە جێگای خۆی دایدەنێیەوە، واتە دوو کەڕەت بێگاری پێدەکا.

بە ڕاستی قەدیم خەلک زۆر دلپاک و خاوێن و بێفرت و فێل بوون. کاک ڕەحمانی برام دەیگوت : ئەگەر مریشکی مەسنووعی نەبانایە بۆ هێلکە کردن حالم شڕ دەبوو، بە هیوای مریشکی ولاتی، سێ ڕۆژان دێن و دەچن و دەقرێنن بەلێ ئەوە دەیانهەوێ هێلکەیەک بکەن.

بۆ زانیاریتان باشە ئەوانە بزانن کە وشەی «مریشک» لە «مرغ خشکی» وەرگیراوە، هەروەک «مراوی» کە وەرگیراو لە وشەی «مرغ آبی»یە.

گوێم لێبوو کابرایەکی دانیشجوو ئامۆژکاری کوڕێکی لەخۆی بچووکتر دەکرد و دەیگوت : کاتی خۆت بە فیڕۆ مەدە، ئەمن لە دانیشگای تاران ٢٤ سەعاتەی ڕۆژانەم ئاوا بەشکردبوو : ٦ ساعەت لە زانکۆ بووم، ٦ ساعەت خەریکی موتالەعە کردن بووم،٦ ساعەت بۆ پرسیار و بژوار. ڕووی لەمن کرد، گوتی فلانکەس چم بۆ مایەوە؟! گوتم وەللا ئەوەندە وەختەی بۆت دەمێنێتەوە بەس بەشی فلان خواردن دەبێ، ناهەقیشم نەبوو، ئەوەلەن چاکم دەناسی، درۆی

دەکرد و ئەوجار کوا ئەوەندە وەختەی مابوو بەشی نان خواردن و خواردنەوە و نووستن و ئیستراحەت دەکا.

دەڵێن کابرایەک چوو بۆ سەر حەوزێک ، چاوی بە خۆی دەکەوێ کە چەند ناشیرینە و دەست دەکا بە تف لێکردن. لێی دەپرسن ئەرێ ئەوە تف لە چی دەکەی؟ دەڵێ وەڵڵا شەیتان لە ئاوەکەدا دەبینم. دەڵێن کورە ئەوە بۆ خۆتی دیاری، دەڵێ توخوا بە راست، وەڵڵا قەت نەمزانیوە کە ئاوا دزێو و ناحەزم.

کابرایەکی ناحەز لەگەڵ ئەوەش کە ناحەز بوو، بۆڵبژێری دەکرد لە ژن هێناندا و بە زۆرکەس رازی نەبوو، پێمگوت : فڵانی بچۆ لە ئاوێنەدا تێر تەماشای خۆت بکە، بە هەموو کچێک رازی دەبی. ئەو قسەی من کاری لەسەر کرد و زۆر زوو ژنی هێنا، لە دواییدا کە دیمەوە گوتی : فڵانی، زۆرت لێ مەمنوونم، کەس تا ئەمرۆ ئاوا ئامۆژگاری نەکردووم،ماڵت ئاوا بێ بە ژن و ماڵت کردم.

ئەوەیە گوتوویانە: دوست ئەو دۆستەیە وەک ئاوێنە عەیبەکانی پێ نیشاندا یان دەڵێن : دۆست ئەو دۆستەیە عەیبەکانت بە دیاری بۆ بێنێ.

## .: بەشی ٨٨ :.

دەڵێن هێمن گوتوویەتی ئەگەر بەڵایەک لە ئاسمان بێتە خوارەوە، دەڵێ ماڵی مام هێمن لە کوێیە، دیارە هێمن هەموو ژیانی هەر دەربەدەری و زیندانی و هەژاری و فەقیری بووە بە زمانی شێعر بۆ خۆی دەپاڕێتەوە و دەڵێ :

ئەی خوای گەورە و خالقی بێ چوون  ئەو کەسەی دات بە ئێمە زار و قوون

یان ئەوان بگرە، یا بکە تێرم  تێر نەبن بۆچمن سەر و ژێرم

دەڵێن کابرایەک بە شۆخی دەیگوت ئەوەندە بێشانس و بەدبەختم ئەگەر هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان ببنە حۆری و بێنە سەر زەوییەک، دانەیان بەشی من نابێ بەڵام ئەگەر مانگ بەتاقی تەنیا ببێتە کەڵەگایەک و بێتە خوارێ، راست وە دوو قونێ من دەکەوێ ... .

دەڵێن «جونەیدی بەغدادی» رۆژێک بەلای جەمعێکدا رۆیی، گوتی ئەو خەڵکە بۆ کۆ بوونەوە؟ گوتیان : دزێکیان گرتووە و لە سێدارەیان داوە. جونەید چوو لاقی دزەکەی ماچ کرد. خەڵکەکە زۆریان بەلاوە سەیر هات، گوتیان جەناب ئەوە چ سیرڕێک بوو؟ گوتی ئەو دزە

هێندە ئیمانی بە کاری خۆی هەبوو هەتا گیانی لەسەر دانا، ئینسان لەسەر هەر عەقیدە و مەسلەکێک بێ، دەبێ لەسەری سوور بێ هەتا دەمرێ و نابێ دەستبەرداری بێ ئەگەر لە سێدارەشی دەن.

بەڵێ زۆر کەس گیانی خۆیان لەسەر ئیدە و مەرامی خۆیان داناوە وەکوو قازی محەممەدی نەمر، ئەمما بۆ هەمیشە ناویان لەناو مێژوو و مێشکی گەلەکەیان هەر دەمێنێ وەک شاعیر گووتوویەتی :

ئەوەی ماوە هەر ناوە بۆ پیس و پاک بەدوویانەوە تا هەیە ئاو و خاک
لکا ناوی بەدفەڕ بە سەد جوێنەوە هەزار تووک و نەفرینی بە شوێنەوە
بەشی پیاوی باش ئافەرین و نزان لە خۆشی ژیان دان کە خۆشیان رزان

شاعیرێکی دیکەش دەڵێ :

خۆزگەم بەو کەسەی بۆ نیشتمانی خۆی دەکا بە قۆچ، قۆچی قوربانی
چونکە نیشتمان بێشکەیە بۆ گەل، مایەی ژیانە بۆ گەل تا ئەجەل

## :. بەشی ٨٩ :.

سەعدی دەڵێ کابرایەک شەوێک لەسەر نەخۆشێک هەتا بەیانی دەگریا، رێکەوت بەیانی نەخۆشەکە چا بۆوە و کابرای ساغ و سەلیمیش مرد. ئەوەیە شافیعی گوتوویەتی :

«فَکَمْ مِنْ صحیحٍ ماتَ مِنْ غَیْرِ عِلَّةٍ وَ کَمْ مِنْ مریضٍ عاشَر دَهْراً علی دَهْرٍ وَ کَمْ مِنْ فتی یُمْسی و یُصْبِحُ امِناً وَ قَدْ نُسِجَتْ اَکْفانُهُ وَ هُوَ لا یَدْری.» زۆر کەسی ساغ هەن کە لەناکاو بێ ئەوەی نەخۆش بن دەمرن، هەروەها زۆر کەسی نەخۆشیش هەن کە بە رواڵەت دەڵێی ئێستا نا ئێستا دەمرن؛ کەچی چاک دەبنەوە و چەندین ساڵ دەژین، هەروەها زۆرێک لە گەنج و لاوەکان شەو بە ئەمینی لە نوێن و باندا لێی دەنوون و دەخەون، بەخۆ نازانن کراسی مەرگیان بۆ دەدروون و لە ناز و بازی ژین و ژیوار بێبەش دەبن و لە شاری خامۆشان لە نوێن و بانی گڵدا لێی دەنوون. هەر وەکوو شاعیر گووتوویەتی :

دەزانی میوە بۆچی شیرینە شەکرە سێو نووستوون لەو ژێرزەمینە
هەواکەی خۆشە مەڵبەندی نەبوون هەموو کەس بە توێی کراسێ نوستوون

هەروەها لە بابە عوریانەوە دەڵێن :

دونیـا سـفرەیە و مـرۆڤ میوانـە ئـەمڕۆ گـوڵزارە و سـبەی خەزانـە
چاڵێکی زۆر قوڵ کـە نـاوی گـۆڕە دەڵێن ئێرە جێی گشت میر و خانـە

هەروەها هەژار دەڵێ :

ئـەو سـەرچاوانەی لەسـەر هـەردانن فرمێسـکی چـاوی جوانەمـەرگانن
نەرگزی چاومەست دەمـە و بـەهاران کە دەڕۆین لە لای دەشت و کۆساران
چـاوی جوانانـە کەوتۆتـە بـن گـڵ نیشانمان دەدا گەردوون لەسـەر چـڵ

ئیبراهیمی ئەفخەمی دەڵێ :

لـە شـینی هـەر عـەزیزێ ماتەمێکـە پـەژارەی هـەوری شـینە یـا تەمێکـە
بەڵام فـەرقی زۆرە شـین هـەتا شـین بڕێک شین سەرچڵێکە و سەردەمێکە
دەسا شـینی وەهـا زۆر دێتـە گـۆڕێ ئەگەر عاسمان وەسەرکا قوڕ کەمێکـە

خۆش بە حاڵی ئەو کەسانە کە بە چاکی دەژین و بە چاکی دەمرن، کەوابوو مردنی پیاوی چاک و پیاوی خەراپ قەت وەک یەک نین، عاسمان و ڕیسمانیان فەرقە. خوایە مان و نەمانمان لەگەڵ خێڵی پاکان بێت.

# .: بەشی ٩٠ :.

کە ئینقیلاب کرا بە حاجیەکیان گوت : ئێستا کوردەکان بۆ خۆیان ئیدارەی شاری دەکەن و دەوڵەت دەسەڵاتی نەماوە، گوتی : پێمخۆشە تا کوردی خۆمان هەبێ غەوارە چ کارەیە. دوای ماوەیەک پێیانگوت ئێستا شار نیوەی بەدەست دەوڵەتەوە، نیوەی کەشی کورد ئیدارەی دەکەن. گوتی خوا تۆفیقی هەردووک لا بدا و هەردووکیان پایەدار بکا. دوای موددەتێک گوتیان دەزانی کورد هیچی بەدەست نەماوە و دەوڵەت تەواوی شاری بەدەستەوە، گوتی : پێمخۆشە، دەوڵەت بابی میللەتە، بە قامێ خالکی هیچ ناکرێت. بەڵێ ئەو کەسانەی کە بە هەموو بایەک دەلەرزن، بێ بایەخن، دیارە مرۆڤ نابێ وەک گوڵەبەرۆژە بێ و لەگەڵ ڕۆژ بگەڕێ، بەڵکو دەبێ یەکڕوو بێ و بۆ قازانجی خۆی هەر ڕۆژە لەگەڵ یەکێک نەبێ و لەکوێ پەڵەیدا و سفرەکە چەور بوو سڵاوات لە دیداری وان لێدابەڵکو دەبێ قازانج و نامانجی جەماوەریش بە هی خۆی بزانێ و خەمخۆری وان بێ، هەر نەڵێ : ئاورە سوورە، لەخۆم دوورە.

دەڵێن چوار نەفەر لەسەر ناوی ترێ لێیان ببو بە ناخۆشی و دمە تەقە، کابرایرک گوتی ئەوە چییە، ئەوە لەسەر چی لێتان بووە بە شەڕ، کوردە گوتی ئەو میوە کە لێرە داندراوە ئەمن دەڵێم ناوی «ترێ»یە، ئەم برادەرە کە فارسە دەڵێ ناوەڵلا ئەوە «انگور»ە، ئەوە کە عەرەبە دەڵێ نەخێر هیچ کام لەمانە کە دەڵێن نییە و ئەوە «عنب»ە، ئەو کاکەش کە توورکە دەڵێ هیچیان بایی تووری تەڕی لێنازانن و ئەوە «روزومە»، کابرَاکە کە زمانی هەمووانی دەزانی گوتی کاکە هەمووتان راسە دەکەن بەڵام ئەوەتان خەراپە هەر کامتان بە زمانی خۆتان دەیڵێن و هیچتان لە زمانی ئەوەی کە ناگات، دیارە ئەگەر لێک حاڵی بوونایە تووشی شەڕ ودەرگیری نەدەبوون.

دەڵێن لە دێیەک جەوانێکیان تەرخان کردبوو بۆ خوێندن، گوتیان با بە هەر هەموو دێیەکە میرزایەکمان هەبێ. کوڕە چەند ساڵێکان دەرسی خوێند و هاتەوە بۆ دێیەکەیان. خەڵکی ئاوایی لە دەوری کۆ بوونەوە، ئەوە خۆشی خۆشی میرزاکەمان بۆ پێگەیشتووە. دەڵێن دەی کاکە میرزا، شوکر بۆ خوا ئێستا سەواد داری، خۆ هیچ موشکیلێکت لە خوێندن و نووسیندا نییە. دەڵێ ناوەڵلا، زۆر باشم، بەڵام لە حیسابدا تا دە هیچ موشکیلم نییە، بەس کە دەگەمە دە، یەکەکە دەنووسم بەڵام نازانم نوختەکەی لە لای راست بنووسم یا لە لای چەپ. هەی گوتیان بەخێر نەیەوە، پێت سوور بووینەوە، خۆشی خۆشی ئەوە گووخۆرمان بۆ پێ گەیوە. دیارە قەدیم خوێندەواری کەم بووە.

دەڵێن مامۆستایەک لە دێیەک موعەللیم دەبێ، حیسابی هەتا هەزاریان فێری قوتابیان دەکا و دەڵێ منداڵینە حیساب تەواو بوو، منداڵەکان کە دەچنەوە ماڵ باس دەکەن، دەڵێن ئەمڕۆ حیسابمان تەواو کرد و هەتا هەزاری بە تەواوی فێر بووین، باوکی یەکێکیان دەڵێ رۆڵەم خۆ حیسێب هەتا هەزار نییە، باڵاتریش هەیە، دە هەزار هەیە، سەد هەزار هەیە و ملوێن هەیە و ....، دوارۆژ منداڵەکە بە مامۆستاکەی دەڵێ بابم گووتوویەتی حیساب لە هەزاری تەواو نابێ و باڵاتریش هەیە، مامۆستا دەڵێ : راستە بەڵام باڵاترەکە هەر بە زار هەیە، بە نووسین هەر هەتا هەزاری هەیە.

## .: بەشی ٩١ :.

سەعدی دەڵێ کابرایەکی فەقیر کچێکی زۆر ناحەزی دەبێ، کە کەس نایهەوێ، دەیدا بە پیاوێکی کوێر. دوای ماوەیەک دەڵێن دوکتوورێک پەیدا بووە چاوی کوێران چا دەکاتەوە،

زاواکەت بەرە بۆ لای هەتا چاوانی چاک وەکا، کابرا دەڵێ خواخوامە چاک نەبێتەوە، هەر چاوی بە کچەکەم کەوێ پەشیمان دەبێتەوە و دەینێرێتەوە بۆ خۆم. بە راستی ژنی ناحەز ورچی بەرئاوری ناو ماڵەوەیە. دووبارە سەعدی دەڵێ : ژنێک بە پیاوەکەی گوت : ماڵت خەرا نەبێ، وەک ژەنگە سوورە وای هەر پێوەدانت هەیە، واتە شەوانە بۆ کاری ئاوا ئازای، بۆ ئاچی کار و ئیشێک بکەی تەنبەڵ و تەوەزەل هەر دادەنیشی و دەکەی. ئەوەیە کە دەڵێن : «تەبەکی پڕ، ئاشتی ناو ماڵە» یا دەڵێن دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە، «تا رنج نبری، گنج نبری»، دیارە ئەو ژنە ناهەقی نەبووە. پیاو دەبێ کار و ئیشێک بکات هەتا ماڵ و منداڵی فەقیر و موحتاج نەبن بەڵام با لە مەقامی شۆخیدا ئەوەش بڵێین کە لە ژناندا ئەوە یەک بە پیاوەکەی بڵێ ئەتۆ هەر بۆ کاری شەوێ ئازای و نارەزایەتی خۆی لەمبارەوە دەربڕێ. ژنێک بە مێردەکەی گوت شەوێ خۆ دەمرێنی و رۆژیش دەڵێی گورگی. سەعدی دەڵێ : کابرایەک لەکن ریش سپیەک شکایەتی لە ژنەکەی کرد و زۆر بە توندی نارەحەتی خۆی دەربڕی، کابرا گوتی : ئاوا نابێ تۆش دەبێ حەوسەڵەت لەگەڵ ژنەکەت هەبێ، شەوانە تۆ بەرداشی سەرێ و ئەو تەحەمولت دەکا، بە رۆژ نۆبەی ئەوە کە بەرداشی سەری بێ، تۆش دەبێ تەحەمولت هەبێ، دیارە ژن و پیاو لەگەڵ یەک دەبێ بە حەوسەلە بن.

دەڵێن ژن وپیاوێک لەبەر پیریان کۆم دەبنەوە، رۆژێک لە ناو مووچە، خاڵە پیرە کە کز و لاواز دەبێ لەولاوە دێ و ژنەکەشی کە قەڵەو و بە خۆوە دەبێ لەملارا بە کۆمەکۆم دێت. چاویان لە یەکتر نابێ لەپڕ را خۆ پێکدادەدەن.

پیـــــــــری و هـــــــــەزار دەرد دێوەزمەی پیری هاتۆتە کـۆڵـم
لە بۆیە وەها دەست و پێ کۆڵم

خاڵە پیرە هەڵدەدێرێ و هاوار دەکا دەڵێ : بمگەنێ گارەشی تێی هەڵدام و هەڵی داشتم، پوور دەڵێ خدرۆکە مەگری، گارەش نەبوو، ئەمن بووم. خاڵ دەڵێ ماڵت خەرا نەبێ خەج، وەڵڵا تۆڵەی هەموو ساڵانت لێکردمەوە، پوور پێدەکەنێ و دەڵێ ئێستا لە کوێتە، قورت بەسەری.

دەڵێن کچێک لەگەڵ دایکی زۆر خەراپ دەبێ، کاتێک کە دایکی دەمرێ لەسەر قەبرەکەی دەست دەکا بە گریان و رۆڕۆ و سەر و پرچ دەرنێتەوە، ژنێکی دراوسێیان دەڵێ لە قورێت نیم، ئەگەر راستکەی بۆ خۆم ئاگادار نەبووم چەندەی لەگەڵ خەراپ بووی، هەتا مابوو قەدر و رێزت لێگرتبایە نەینا ئەوە «قوولەی پاش گورگیە.»

# .: بەشی ٩٢ :.

دەڵێن کابرایەک چوو بۆ گوندێک، تەماشای کرد شاخێکی بڵند لە پشتی دێیەکەیە و وا وێدەچێ کە هەر بێنا بەسەر دێیەکەدا رووخا. کابرا خەڵکی ئاوایی لە خۆی کۆ دەکاتەوە و دەڵێ ئەوە ناترسن ئەو شاخەتان بەسەردا بێت و ماڵتان خەرا کا؟ دەڵێن بەڕێوەڵڵا بەڵام ئەوە لە قوەی ممدا نییە، کابرا دەڵێ هەتا بەهارێ بەخێوم کەن، ئەمن بەتەنێ بۆتان لادەبەم، خولاسە تا بەهارێ کابرای رادەگرن و هەر جەمە لە ماڵێک تێر و پڕی دەکەن، کە بەهار هات کابرا پەنجا پیاوی ئاوایی و گوریسێکی درێژ هەڵدەگرێ و دەچن کە شاخەکە لابەن. کابرا گوریسەکە لە شاخەکە دەکا و دەیدا بە دەستی پەنجا پیاوەکە و خۆی بە دەستووری کۆڵێ چوو لە بن شاخەکەوە و گوتی دەی خەڵکینە، لێم هەڵدێرن هەتا لە کۆڵی کەم و لایبەم هەرچی تەکانیاندا هیچیان بۆ لەگەڵ نەکرا و لە جێی خۆی نەجووڵا. گوتیان کاکە لە تاقەتی ئێمەدا نییە، گوتی ماڵتان خەرانەبێ، بە هەمووتان نەتوانن وەکۆڵێم دەن ئەمن چۆنی بەتەنێ هەڵگرم؟ دیارە ئەو کابرایە گەلۆر بووە، بەو فێڵە خۆی بە خەڵک بەخێو کردووە.

دەڵێن خەڵکی ئاواییەک جەوانێکیان لێ عاسێ ببو و هەرچی دەیانکرد کە نوێژان بکا هەر نەیدەکرد. بە مامۆستایان گوت داخوا ئەو کوڕەمان بۆ ناهێنیەوە سەر رێی راست و نوێژانی پێ بکەی. مامۆستا لەگەڵ کوڕە دادەنیشێ و دەڵێ بۆ نوێژ ناکەی، کوڕە دەڵێ وەڵڵا مامۆستا لەبەر نوێژی بەیانی دڵم ناچێ بۆ نوێژ کردن، ئەوەندە ناخۆشە لەو خەوە خۆشە هەستی و دەست و دەم و چاو بشۆی و نوێژ بکەی. مەلا دەڵێ : وەباڵی نوێژی بەیانیت بە ئەستۆی من، مەیکە بەڵام نوێژەکانی کە بکە. کوڕە قبووڵی دەکا و دەست دەکا بە چوار فەرزە بەجێ هێنان. خەڵکی ئاوایی کە ئەوە دەبینن بە توندی دەچنە لای مەلا و دەڵێن چۆن فوتوای ئاوات بۆ داوە و نوێژی بەیانیت ئازاد کردووە کە نەیکا و خولاسە زۆر سەرکۆنەی مەلا دەکەن، مامۆستاش دەڵێ : کاکی جەماعەت! ئەمن بە تەنیا لە پێنج فەرزە، چوار فەرزانی پێ بەجێ دێنم، ئەوەش پیاو بێ و بە هەمووتان نوێژی بەیانی پێبکەن، بەڵێ پوور نەدەترێ، بە زۆریان دەتراند.

دەڵێن لە زەمانی هارون الرشیددا کابرایەک پەیدا بوو کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد. هارون گوتی بیگرن و یەک مانگ لە زیندانی کەن و خزمەتی چاکی بکەن. دوای یەک مانگ، هارون چوو بۆ لای و گوتی : تۆ دەڵێی پێغەمبەرم، پێغەمبەریش دەبێ نیشانە و موعجیزەی پێبێ

و وەحی بۆ بێت. گوتی قوربان هەر ئەمشۆ فریشتەی وەحی هاتەلام و پێی گوتم لێرەت خۆشتر دەست ناکەوێ، مەڕۆ دەرێ.
بەڵێ زۆری ئاوامان هەن کە نانەگەدە و موفتەخۆر و عەوامفەریبن خۆ بە خەڵک بەخێو دەکەن و دەبنە سەر باری خەڵک، بە قەولی سەعدی :

بـــرو کـــار کـــن ای دغـــل　　مپندار خود را چو روباهی شل

# .: بەشی ٩٣ :.

دەڵێن مەلایەک لەگەڵ مەلەوانێک لە کەشتیەکدا سوار دەبێ، مەلا بە مەلەوانە دەڵێ ئەرێ هیچ لە خوێندن و مەلایەتی دەزانی؟ مەلەوانە دەڵێ وەڵڵا هیچم نە خوێندووە و هیچ نازانم، مەلا دەڵێ : نیوەی عومرت بەزایەچووە، لەو کاتەدا دەکەونە ناو شەپۆلی بەحر و کەشتی خەریکە غەرق دەبێ. مەلەوانە ناو شەپۆلی بەحر و کەشتی خەریکە غەرق دەبێ، مەلەوانە دەڵێ مەلا هیچ لە عیلمی مەلە دەزانی؟ دەڵێ ناوەڵڵا، دەڵێ ئەتۆ تەواوی عومرت بەزایە چووە ... .
دەڵێن تەنبەڵیان کۆکردنەوە کە بیان بەن بۆ تەنبەڵخانە، لە ڕێگا کابرایەکی مەرداز چاوی پێکەوتن و بەزەیی پێداهاتن، گوتی من هەموو ڕۆژێک مەرێکیان بۆ سەر دەبڕم و بە گۆشتاو لێدەنیم و لەگەڵ نان بۆیان دادەنیم. یەکێک لە تەنبەڵەکان هەڵیدایە گوتی : دەبێ بۆ خۆشمان تێیگوشین ... کابرا گوتی حاشا ئەوانە هەر بۆ تەنبەڵخانە باشن.
ئەمویە کە دەڵێن ئاوی دانوانی بەخۆدا کردووە، یان خوا هەتا کێوان نەبینێ بەفریان ناوێتێ یا وەکوو دەڵێن دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە.
دەڵێن کابرایەکی تەنبەڵ لەسەر کۆ گوێزێک دانیشتبوو و خەریکی گوێز خواردن بوو، کابرای ساحەبی گوێزان گوتی کاکە ئەوە خەریکی چی؟ کابرا گوتی خۆ دەنک دەنک دەخۆم، کابرای ساحەب گوتی : ئەمنیش لەوە دەترسم کە دەنک دەنک دەخۆی چونکە دەنک دەنک خڕم کردوونەوە ئاوا زۆر بوون و تۆش دەنک دەنک کەمیان دەکەیەوە.
کەوابوو ئینسان واباشە سەرسوالکەر نەبێ و بە مفتەخۆری ژیان نەباتە سەر، بەڵکو دەبێ عیززەتی نەفسی هەبێ، بە قەولی هەژار لە خەییامەوە :

ڕابوێرە بەسەربەرزی بە نان و ئاوێک　　سەر دامەنەوێنە بۆ هـەموو ناپیاوێـک
لەم ژینە کە هەر دەمێکە دێت و دەڕوا　　مەردایەتی مەفرۆشە لـەپێناو تاوێـک

بە ڕاستی مەرگی بە عیززەت باشترە لە ژیانی بە زیللەت.

# .: بەشی ٩٤ :.

ساڵی ١٣٤٢ی هەتاوی کابرایەکی جیرانمان لە نزیکی ماڵی مە زەراعەتی دەکرد، ئێمەش مانگامان هەبوو، جارجار کە مانگاکە دەچوو ناو زەراعەتەکە، ئەویش کە زۆر زمان پیس بوو دەستیکرد بە هات و هاوار و جنێودان. شەوێک کا خدری برام گوتی لە گەڵم وەرە ئەوشۆ دەچین ئەو کابرایە ئەدەب دەکەین، منیش گوتم کورە لێی گەڕێ پێی ناوێرین، با کارمان پێنەبێ. خولاسە قەلس بوو و گوتی دەزانم ترسەنۆکی و لێی دەترسی، هەر لەگەڵم وەرە و کارت نەبێ. کە چووین کابرا خەریکی ئاوداشتن بوو، کا خدر لەنەکاو دایگرت بە کوتەک و شەق و پێلاقان هەتا خستی، کابرا دەستیکرد بە هاوار و گورە کە کوشتیانم و خۆی بووراندەوە، من هەر بە پەلە هەڵاتمەوە بۆ ماڵ، جەماعەت کە خڕ بوونەوە و کابرایان وە هۆش هێنایەوە هەر چۆنێک بوو رازیان کرد کە شکایەت نەکا و بە پوولێک رازیان کرد، هەر ئەوە بوو خوات حەسێنێتەوە تازە دەنگی لێنەهاتەوە.

ئەوەیە کە قەدیمی گووتوویانە:
کوتەک لە بەهەشتەوە هاتووە.
مەزەب چوار و کوتەک پێنج.
شەق دەزانێ قۆناخ لە کوێیە؟!
شەرحی ماری بەداری.

هێندەی تێهەڵدەدەن رۆژی شایی ئەوەندە لە دەهۆڵ نەدرابێ. ئەگەر زمان لێگەڕێ سەر راحەتە، ئەینا ئێمە هەرگیز مەردوومئازار و شەڕانی نەبووین. دەڵێن شەڕ و تڕ بە دەست خۆت نییە.

ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی بابم لە عێراقێ بوو، راپۆرتیان لێدابوو کە ئەمشۆ بە خۆ و بەچەند بارەقاچاخەوە دێتەوە. دایکم و کاک خدرم گوتیان دەبێ بچی بۆ شلماش و ئەگەر بابت گەیشتە وێ ئاگاداری کەیەوە کە بارەکان لەوێ بەجێ بێڵێ و بۆ خۆی بە سەڵتی وەگەڕێ. کە وەڕێ کەوتم هەتا تاریکیم لێهات ئەوجا وە ترس و لەرز کەوتم، بە خۆم گوت وەڵڵاهی ئەگەر بەو تاریکیە بەشێوە چنار و چۆمی شلماشدا بڕۆم سەد دەر سەد شێت و جندار دەبم، ئەگەر بشگەڕێمەوە ئەوە دایکم و کاک خدرم لێم قبووڵ ناکەن. گوتم کورە ئەوەی ناوێ، دەڵێن

خدری زیندوو هەیە، شتێک بەو ناوە دروست دەکەم و خێرا گەڕامەوە و خۆم لەماڵێ هاویشت. دایکم گوتی ئەوە بۆ گەڕایەوە؟ گوتم دایە تووشم رە کابرایەکی ریش سپی جەماڵ پاک کەوت، گوتی : رۆڵەم ئەو کارەی کە بۆی دەچی برۆ لە ماڵەوە چاوەڕوانی بە. دایکم زۆری پێخۆشبوو، خێرا چوو نەقڵەکەی بۆ کاک خدر گێڕایەوە، بە کورتی ئەو شەوە لە نیوەشەودا باوکم بە سەلامەت گەڕایەوە بۆ ماڵێ. سبەینێ دایکم نەقڵەکەی بۆ باوکم گێڕایەوە و هەر لەوەشڕا پێی دەگوتم : شێخیلەی ماڵێ، ئەمنیش لە دڵی خۆمدا دەمگوت ترسۆکەی ماڵێ. هەرچەند لە ترسان ئەو درۆیەم دروستکرد بەڵام بە قازانجم تەواو بوو، بێت و وام نەکردبایە لە ترسان تووشی نەخۆشی رووحی دەبووم. بە راستی عەقڵی خۆم وە فریام هات، ئەوە کە دەڵێن درۆی مەسلەحەت باشترە لە راستی نامەسلەحەت.

جارێکیان لەناو مووچە، دارێکی درێژم بە دەستەوە گرتبوو، لەخۆڕا لەناو دار و دەوەن و کونانم رۆ دەکرد، هەر ئەوەندەم زانی لە کونێکڕا رەش مارێکی گەورەم لیندەرپەڕی و وەشاندی، لە ترسان هەڵاتم و هاوارم کرد : مار، مار، بمگەنێ، خێزانم خێرا گەیشتە سەرم و ماری لە کۆڵ کردمەوە.

پیاو هەقێ بلێ، خێزانم لە من بە غیرەتتر بوو، ئەوەیە کە ئاوارە دەڵێ : بۆ تەنگانان ژنیش پیاون.

ساڵی ١٣٨٤ لە کوێستانی مامەرکوژە میوانی ماڵێک بووین، شەوێ کە دانیشتبووین ساباتەکان لەکانی دوور بوو، سوتفە باسی بە غیرەتی و بێ غیرەتی کرا، گوتم : وەڵڵا ئەمن زۆر ترسەنۆکم. برادەرێکمان بە ناوی مەلا مستەفا گوتی وەڵڵا دەنا ئەمن لە هیچ شتێک ناترسم. گوتم ئەگەر راستدەکەی بچۆ تونگێک ئاو بێنە، خێرایەک تاوی دایە تونگەکە و چوو ئاوی هێنا. سێ چوار لیوانم ئاو لەسەرێک خواردنەوە، گوتم ماڵت ئاوا بێ، لە مێژبوو تینووم بوو، نەدەوێرام بچم بۆ کانی. بە داخەوە بە منالی دایکم بەباسی دێو و درەنج، ترسەنۆکی وەبار هێنابووم. لە هەمووی ئەو بیرەوەریانە ترسەنۆکی خۆم بۆ خوێنەری بەڕێز روونکردەوە، پیاو هەقێ بلێ باشە، ئیوا هەیە هەر بە درۆ خۆی هەڵدەکێشێ و دەڵێ ئاوا و ئاوا ئازا و بوێرم، شێر خۆرم.

جارێکیان شێخ محەممەد خاڵ دەیهەوێ ئەم حەدیسە بکا بە شێعر، «اَلْجَنَّةُ تَحْتَ اَقْلامِ الأُمَّهاتِ» ئەوەی رزگار دەبین پێی رۆژی دوایی - یەکەمیان دڵ بەجێهێنانی دایکە - خودا فەرمووی بە دەربانی بەهەشتێ - ئەلیرەکانە، واتە لە میسراعی ئاخردا گیری خوارد، بۆی دروست نەدەبوو و لەو کاتەدا سوتفە پیرەمێرد وە ژووریٰ دەکەوێ، لە دوا سڵاو و چۆن و چاکی

شێخ دەڵێ : بەخوا لە وەختێکی باشدا هاتی. ئەوە بەو شێعرەوە گیرم خواردوە بۆم ساز ناکرێ و لە میسراعی ئاخردا ماومەوە. پیرەمێرد گوتی چۆن بڵێ ئەوەی زانیت عەزیزی دایکە، شێخ فەرمووی ئافەرین. شێعر و شاعیری کاری تۆیە و کاری من نییە. بەڵێ، شێخ محەممەد خاڵ نووسەرێکی بەرز و قەڵەم بەهێزی کوردستان بوو، شاعیر نەبوو ئەو بەڕێزە، خزمەتێکی زۆری بە فەرهەنگ و ئەدەبی کوردەواری کردووە لەناو گۆڕیشدا هەر شاد و بێوەی بێت.

# :. بەشی ٩٥ :.

کابرایەک دەیگوت : لە دێهاتان دەگەڕام و وەردەواڵەم دەفرۆشت، هەر جەمە دەچوومە هەر ماڵێک، ئەوە خێرا تەماتەیان لە پێش دادەنام. ئاخرەکەی ڕۆژێک تێنم بۆ هات گوتم ئەرێ قۆیسەن بۆ لە کۆڵم نابنەوە. گوتم دەبێ رازی بی خەڵک فەقیرە، چیان هەبێ ئەوەی لێدەنێن.

دەڵێن بێوەژنێک حەزی لە پیاوێک دەکرد، شەوێکیان دەعوەتی کرد. شەویش بۆ نووستنی لە دیوی خۆی جێی بۆ ڕاخست بە ئومێدێکەوە. کابرا ئەو تەنیشتەی لەسەری نوست هەتا بەیانی نەجووڵا، بەیانی کە هەستا، تەماشایکرد گوتی حەوت کەڵەباب بۆ مریشکێکی زۆرن، ژنە گوتی ئاخر ئەوانیش وەک تۆ وان، هیچیان پێ ناکرێت.

ساڵێکیان سێ ڕۆژان لەسەرێک کەنگر و مەندێمان دەخوارد. ئازادی کوڕم کە زۆر شۆخیباز بوو باڕاندی، دایکی گوتی ئازاد ئەوە چییە؟ گوتی هێندەی گیای بخۆم بوومە کارژێلە، گوتی جا بە چ چاکدەبیەوە؟ گوتی دەبێ سێ ڕۆژان لەسەرێک پلاو و گۆشتم بۆ لێنێی.

ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوی چوومە گوندی دێرێ، ڕێکەوت کە گەیشتمە ماڵی مەلا سمایلی خانەخوێم، باوکی خەریکی نەقڵ گێڕانەوە بوو و هەر کە پێم وەژووری نا لە نەقڵەکەدا گەیشتمە ئەم وشەیە کە : «لەو وەختەدا کابرایەکی گروێسی وەژوور کەوت»، منیش وەژوور کەوتم و گوتم : سلام علیکم، ئەمن کابرای گروێسیم، بوو پە پێکەنین. لە دواییدا ترێیان هێنا زۆر چاک نەبوو، مەلا سمایل گوتی : «وَ عَنِبًا وَ قَلْبًا» واتە ترێکەمان خەراپە.

دەڵێن کابرایەکی عەرەب لە گەرمێنڕا دەچێ بۆ وڵاتی فارسان، شەوێ لە ماڵێک میوان دەبێ، ئەو ماڵە کورسیان دەبێ کە کابرای عەرەب لاقانی تێدەکێشێ و گەرمی دێتەوە موناسیبی حاڵی خۆی، دەڵێ : «فِی بِلاَدِ الْفُرسِ عِنْدی بِاخْتِبارِی وَ اخْتِیَارِی، آیةُ الکرسِیُّ خَیْرٌ مِنْ احادیث البُخاری»، ماناکەی بۆ عەرەب زانان بێ.

کوڕێکی کۆمۆنیست دەیهەوێ ژن بخوازێ، چەند نەفەرێکی دەعوەت کردن، منیش لەگەڵ بووم، گوتم : هەتیوە خۆ تۆ موسڵمان نی، مەلا لێتدەپرسێ و ئیقرارت لێوەردەگرێ کە موسڵمانی، ئەگەر نا لێت مارە ناکا. گوتی فلانی لە خۆشی یارەکەم ئەگەر مەلا پێم بڵێ، قبوولی دەکەم. گوتم ناکرێ بە راستی ببی بە موسڵمان؟!! گوتی : ئەگەر وەک فلانکەس موسڵمان بم ئەوە مەشرەبی ئێستام زۆر باشترە و ئەگەر وەک فلانکەس بم هەوێ موسڵمان بم ئەوە وەک ئەوم پێ ناکرێ و ناتوانم بە دروستی بەجێی بێنم.

بە راستی ئینسان دەبێ عەمەل و کردەوەی لەگەڵ ئەو شتەی کە دەیڵێ و بە رواڵەت نیشانی دەدات یەکبێ.

«اسلام به ذات خود ندارد عیبی ، عیبی که دارد از نامسلمانی ماست.»

# .: بەشی ٩٦ :.

دەڵێن کەریم کابان دەچێتە لای مام جەلال و دەڵێ : جەناب شکایەتم لە خەڵکی زۆرە، سێچەرخەیەکی ناقابیل ناویان لێناوە کەریم کابان، مام جەلال دەڵێ : جا بۆ نارازی؟ سێچەرخە سعری بیست ملوێن دینارە، بەڵام ئەو خەڵکە موبایلێکی کە سعری سەد هەزار دینارە بە نێو منیان کردۆتەوە، ئەگەر ناڕازی با وەیانگۆڕین.

ساڵێک لە سابلاغ کابرایەکی شیعە دەچێ لە بازار داران بکڕێ، تەماشا دەکا چوار نەفەر بە رەدیف راوەستاون لە نەفەری ئەوەڵ دەپرسێ ناوت چییە؟ دەڵێ ئەبووبەکر، قەڵس دەبێ و دارانی لێناکڕێ، لە دووهەمی دەپرسێ دەڵێ : عومەر، لەویش ناکڕێ، لە سێهەمی دەپرسێ دەڵێ : عوسمان، لەویش ناکڕێ، دەگاتە چوارەمین، دەپرسێ ناوت چییە؟ دەڵێ : عەلی، دەڵێ مردووت نەمرێ وەمزانی هەر لە خەلافەتدا لەدوایەی خۆ لە کۆڵەداریش هەر لە دوایەی، وەڵڵاهی لەتۆش ناکڕم.

کە ئەم نەقڵەم دەنووسیەوە کابرایەکی تورک وە ژووری دوکان کەوت کە خەریکی نووسینەوەی ئەو نەقڵە بووم، زۆر پێکەنی و بە خەندەوە گوتی : «بریا ئەم کتێبە بە تورکی بوایە هەمووم دەخوێندەوە»، گوتم دەزانی تورک یەعنی چی؟! گوتی نا، گوتم تورک یەعنی جوان، فارس یەعنی نەجیب، کورد یەعنی پاڵەوان.

دەڵێن باوک بۆ منداڵەکانی وەکوو بۆدزێل وایە کە کێو و شاخ و چڕ و تەلانی پێ تەخت دەکەن و هەڵدەدڕن بۆ جادە لێدان. کاتێک کە کارەکەی تەواو بوو قیلەتاو و ئەسفالت کرا ئەوجا نایهێڵن بەسەر جادەکەدا بڕوا.

دەڵێن خەراپی دەکەیەوە هەرچی هاوار بکات و بڵێ ئاخر خۆ ئەمن ئەو جادەم خۆش کردووە، جەوابی نادەنەوە. هەروەها باوکیش ئەو هەموو زەحمەت و کوێرەوەریەی دەبینێ کەچی کە پیر بوو ئەولادەکانی پێی دەڵێن بڕۆ، ئەتۆ هیچکارە نی و باسی هیچ ناکەی. بەدبەخت و بێدەسەڵات و بێکەس و بێدەر و چاولەدەست دەمێنێتەوە. هاوار لەدەست ئەولادی خەراپ.

## .: بەشی ٩٧ :.

ئەوە نموونەی چەندێک لە زەربولمەسەل و پەندی پێشینان :

دەڵێن :

پیاوی ڕووخۆش شەریکی خەڵکە.

تووڕەبوونی پیاوی ئاقڵ چاکتر لە ماریفەتی پیاوی بێ ئاقڵ.

دونیا وەکوو تاوە و بە تاوێ تێدەپەڕێ.

مەرگی بە عیززەت باشترە لە ژیانی بە زیللەت.

لە کوێ پسا لەوێ گرێی دەوە.

هەتا مانگەشەو بوو بڕۆ، ئەگەر تاریکیش بوو بیخە.

دونیا پێنج و دوو ڕۆژێکە.

پیاو ئەو پیاوەیە مەردی مەیدان بێ.

ماران بەدەستی خەڵکی بگرە.

پیاو دەبێ بەحر بێ و بە هیچ شلوێ نەبێ.

دونیا دەسڕۆکەیە و هەردەم بەدەست یەکێکەوە.

برینی خەنجەر چا دەبێتەوە، بەڵام برینی زمان چا نابێتەوە.

لە برسان بمرە، بەڵام مەچۆ دەرکی پیاوی نامەرد.

ماڵ ڕاگرتن لە ماڵ پەیداکردن بەزەحمەتترە.

پیاو یان دەبێ بۆ خۆی پیاو بێ یان لە پەنای پیاوان بێ.

دوژمنی زانا لە دۆستی نەزان باشترە.
شەرافەت و کەرامەت لە سەرووی هەموو سەروەتێکە.
هەرچی سمێڵی سوور بوو هەمزاغا نییە.
دۆستایەتی لەگەڵ مردوو ناگیرێ.
سەری بێرۆژوو لەبن گڵ دایە.
هەرکەس لە رانکی خۆیدا پیاوە.
شووشە کە شکا، قیمەتی کەم دەبێ مەگەر شووشەی دڵ کە قیمەتی زیاد دەکا.
دەڵێن زالم و ملهوڕ وەک ئاگر وان.
دەڵێن زەمانە دەمێک بە مەیلە و دەمێک بێ مەیلە.
هرچی بیچێنی، دەیدروویەوە.
گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە.
نیر گە لە کیفاری هەڵناکەوێ.
گۆزە چی تێدابێ ئەوە دەدەڵێنێ.
لە قەدەر لێفە پێیان راکێشە.
ڕێوی بە کونی خۆی بوەڕێ گڕەێ دەبێ.
تەماع سەری نەبڕی، سەرت دەبڕێ.
قەناعەت هەوێنی تەماعە.
تەماع سوێراوە، تا وەیخۆی تینووتر دەبی.
خەم، خەمان دێنێ.
رەفیقی خەراپ لە مار خەراپترە.
گا رەنگی گا ناگرێ، بەڵام خووی دەگرێ.
ڕێویەکی گەڕاو باشترە لە شێرێکی نوستوو.
خووی شیری، هەتا پیری.
عیلمی کەمی لە سینە باشترە لە یەک سەفینە.
شوو، کە بە تەڕی دانەیێ بە وشکی دانایێ.
بەردێک نەزان لە گۆمی هاوێ، بە سەد زانا نایەتەوە دەر.
مەژی بۆ مردن، بمرە بۆ ژیان.
نەسرەوتن تا سەرکەوتن.
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە.

تەبەکی پڕ، ئاشتی ماڵە.
بەردی لەخۆوە سەری ساحەبی دەشکێنێ.
پیاوی بولڵزمیر هەر دەکەوێتە ژێر.
بە کەمی لە زۆر حاڵی بە.
دەستێک کە نەتوانێ بیگەزێ ماچی کە.
کانییەک کە ئاوت لێخواردەوە بەردی تێماوێ.
بە بێ کەڵەباب رۆژ دەبێتەوە.
دەڵێن ماڵ بۆ ژیانە نەک ژیانە بۆ ماڵ.
کە مەلا نەبوو بە کەڵەباب دەڵێن : بلقاسم.
پووڵی بدە و مەلای لە مزگەوت وەدەر کە.
بەرە لە تەنکیوە دەدڕێ.
ماستێک بۆ تۆ نەبێ خۆڵی تێکە.

## .: بەشی ٩٨ :.

دەڵێن دوو نەفەر چاویان بە خاڵە پیرێک کەوت کە قوورقووڕ دەگریا. چوونە لای گوتیان خاڵە ئەوە بۆ دەگری، گوتی : وەڵڵا بابم لێی داوم. زۆریان پێ سەیر بوو، گوتیان ئەم خاڵە بۆخۆی ئاوا پیرە دەبێ باوکی چەند پیر بێ؟! خولاسە هەر چۆنێک بێ چوون گەڕان و باوکیان دیتەوە، خاڵە پیرێکی سەرسپی پشت کووڕ، گوتیان خاڵە ئەوە بۆ لە کوڕەکەت داوە؟ گوتی : ئەو ئەحمەقە دڵی بابمی هێشاندووە و شۆخی پێکردوون، دەبێ زۆر چاکی تەنبێ بکەم، گوتیان هەی هوو، بە خوا ئاوا بڕۆینە پێش دەگەینە سەر بابە ئادەم.

دیارە خەڵکی قەدیم ساغتر و بێخەمتر بوون و لەبەر ئەوەش تەمەنیان درێژتر بووە.

دەڵێن کابرایەک کیلۆیەک گۆشت دەکڕێ و دەینێرێتەوە بۆ ماڵ. ژنەکەی کە دۆستی دەبێ گۆشتەکە سوور دەکاتەوە و دەرخواردی دۆستەکەی دەدا. ئێوارێ کە مێردەکەی دێتەوە هیچیان نابێ، ژنەکەی دەڵێ کابرا دەزانی ئەو گۆشتەی کە ناردبووتەوە پشیلەکە خواردی، کابرا خێرا پشیلەکە دەگرێ و وەزنی دەکا، یەک کیلۆ دەبێ، دەڵێ : ئافرەت ئەی کوا یەک کیلۆگۆشتەکە، ژنە دەڵێ لەپێش تۆدا یەک کیلۆی پیسایی کرد، ئەوە گۆشتەکە بوو داینەوەتەوە.

ئەوەش فرت و فێڵ و مەکری ژنان. «اِنَّ کَیدَ کُنَّ عَظیم»

دەڵێن لە دێیەک شایی دەبی، گۆرانی بێژ ئەو بەندە دەڵێ :

«هەڵی تەکینە، قەزات لە ماڵم، سەرگۆی مەمکت، نەخشی لە باڵم»، ژنێکی فارس لەوێ دەبێ، بە کابرایەک دەڵێ دەبێ بۆم مەعنی وەکەی بزانم ئەو بەندە یەعنی چی؟! کابراش کە چاک فارسی نازانێ ئاوای بۆ مەعنی دەکاتەوە : «بلند و پایینش کن، دردت بە جونم، نوک پستانت تا ببوسم.»

دەڵێن کابرایەکی خاریجی دەڵێ : ئەگەر شەمعێکم بە دەستەوە بێت کە هەر دوو سەری داگیرساو بن لەو کاتەشدا رەفیقان لەیاد ناکەم.

دونیای دۆستایەتی یەکجار گرنگە، دەبێ ئینسان لەگەڵ موشکیلەی زەمانەش دۆستان لەبیر نەکا و جارجار سەردانیان بکا، ئەمما دۆست و رەفیقی واقیعی و راست؛ چونکە رەفیقی چاک لە شایی و لە شین شەریکتە و بۆ رۆژی تەنگانە بە کارت دێت، بە تایبەت دەبێ ئینسان دۆستانی باوکی فەرامۆش نەکا چۆن یەکێک لە نیشانەی وەفاداری منداڵ بۆ باب و دایک ئەوەیە کە بە رێزەوە بڕوانێتە دۆستانی دایک و بابی.

بە داخەوە لە دنیای ئەمڕۆدا مەقامی دۆستایەتی و رەفاقەتی هیچ رێزی نەماوە و حیسابێکی لەسەر ناکرێت، بە هیوای ئەو رۆژە کە ئاوڕێک لە دونیای دۆستایەتی و رەفاقەت وەدەین چونکە لەم دونیایەدا ئینسان هەر بە تەنیا خۆی بەس نییە، بەڵام بەو شەرتە بزانین کێ بە دۆست دەگرین. قەدیمە دەڵێن : دۆست بگرە بە دینارێک، ئەمما مەیدە بە هەزار دینار.

## .: بەشی ٩٩ :.

دەڵێن دونیا مەیدانی تاقیکردنەوەیە، ئەی برای بەڕێز لە بەرامبەر هەموو رووداوێکدا بوێر و خۆڕاگر بە و نەدۆڕێی و نەگۆڕێی و لە کلی تاقیکردنەوەدا دەربچۆ، ئەگەر وابێ دەگەیە بواری رزگاری و مەیدانی شادی و بەختەوەری، هەروەها بە پلە و مەقام خۆت لێنەگۆڕێ و خۆت لە خەڵک جیا مەکەوە و دوورە پەرێز مەبە. دەڵێن دونیا بە خەمان پێک نایە، کەوابوو ئەی ئەو کەسەی کە خۆشەویستێکت لەدەستداوە یا ئەوەی کە تووشی رەنج و ناڕەحەتی بووی، دەبێ سابیر و خۆڕاگر بی و رەزا بە قەزا بی چونکە قەزا و قەدەری خوا حیکمەتێکی تێدایە کە ئێمەی بەشەر دەرکی ناکەین.

ئەی ئەو کەسەی کە نەخۆش دەبی دڵت بەهێز بێ و نائومێد نەبی، بە یاری خوای گەورە شیفات بۆ دێ و وەک جاری جاران دێیەوە سەرحاڵ و بە لەش ساغی ژیان دەبەیە سەر.

ئەی ئەو کەسەی فەقیر و هەژاری، خۆت مەخە گۆمی خەیاڵات و خەمان و مەڵێ تازە ئەمن ناتوانم بەو ئاواتانەی کە دەمهەوێ بگەم و تا سەر هەروا رووت و رەجاڵ دەبم، هەوڵ بدە و کار و کۆشش بکە و خۆت لە هەژاری رزگار بکە. ئاقڵ ئەو کەسەیە بە بەش و باری خۆی رازی بێ و خەم و پەژارە لەسەر خۆی نەکاتە کۆڵ، بەشکوو مشوور خواردن و قەناعەت و تێکۆشان هەموو لایەنە تاریکەکانی ژیان رەوشەن دەکەنەوە.

ئەی ئەوکەسەی کە دڵداری و عاشق بە یارەکەتی، بۆ دڵبەرەکەت ژین و ژیوار لە خۆت تاڵ مەکە، خوا یار بێت بە وەسڵی یارت دڵشاد دەبی و دەبن بە هاوڕازی خەم و شادی و کۆڵەکەی ژیان بۆیەکتر. بە قەولی سەعدی :

زن خـــوب و فرمـــانبر و پارســـا کنـــد مـــردی درویـــش را پادشـــا

ئەی ئەو کەسەی کە زیندانی یا پەرپوەی هەندەرانی، ناڕاحەت مەبە، خوا دەرووی خێزانت لێدەکاتەوە لە بەندوڕکە و دەربەدەری رزگار دەبی.

ئەی ئەو کەسەی کە تا ئێستا خوا منداڵی نەداویەی، داخ لە دڵ مەبە و هیوادار بە بە داهاتوو، زۆر کەس هەن کە بە رواڵەت ساحەبی منداڵە بەڵام هەر ئەو منداڵە لێیان دەبن بە دووپشک و مار و ژیانیان لێ تاڵ دەکەن. ئینسان هەر ئەوەنییە کە بە ماڵ و منداڵ ناوی خۆی بۆ دوای خۆ بهێڵێتەوە بەڵکوو هونەر ئەوەیە کە ئینسان لەدوا مردنی بە چاکی و پاکی نێو و نێوبانگ بۆ خۆی بەجێ بێڵێ و ببێتە نموونە بۆ وەچەی دوای خۆی.

ئەی ئەو کەسەی کە تووشی موشکیلەی زەمانەبووی، دەخیلە نەکەی «خۆ کوشتن» بە تەنیا رێ و چارەی خۆت بزانی، بە فکر و راوێژ لەگەڵ دۆستان و خزمان زۆر بە سووک و ئاسانی دەتوانی کەند و کۆسپی ژیان لەسەر رێ لابەی و ژیانێکی دوور لە خەم و پەژارەی نوێ دەست پێ بکەی و تەمەندرێژ بی، بە داخەوە ئەمڕۆ دیاردەی «خۆ کوژی» لەنێوان کوڕان و کچانی بە تایبەت گەنج زۆر زۆر بووە و زۆر جار هەبووە لەسەر مەسئەلەیەکی زۆر چووک خۆیان لە ژیان بێ بەش کردووە، وەرن ئەی خەڵکینە قۆڵی هیممەت هەڵکەن ونەهێڵین چیدی ئەو گەنج و لاوانە تووشیان لەم دیاردە ناحەزە بکەوێ. وەرن ئەو کەند و کۆسپانەی زۆرێک لە بنەماڵەکان لەبەر رێی کوڕان و کچان دایانناوە لایان بەین و ئەوانەی رازین بە خۆشەویستی یەکتر بە رەزا و رەغبەتی خۆیان و بنە ماڵەکەیان بە یەکتر بگەن.

ئەی ڕەقیب تووشی بەڵایەک بی نەجاتت قەت نەبێ
مانعی وەسڵی حەیاتم بووی، حەیاتت قەت نەبێ

دەڵێن دونیا لەخۆت مەکە بە زیندان، جا ئەی ئەو کەسەی ئەم دنیا پان و بەرینەت بە خەم و خەفەت لە خۆت کردووە بە زیندان، وەرە و ژەنگە سوورەی خەم و خەیاڵان لە دەوری خۆت هەڵفڕێنە و دونیا بکە بە بەهەشت و گوڵ و گوڵزار. لەگەڵ فرشتەی شادی دەست لە ملان بە و دێوەزمەی خەم و پەژارە لە خۆت وەدوور خەوە و بە یادی خوا دڵت ئاوا کە، شەوی تاریکی خەم و پەژارەت ڕۆژی ئازادی و خۆشی لێ هەڵدێت. ئەی ئەو کەسەی دەسەڵاتداری، غەڕڕە مەبە و زوڵم لە خەڵک مەکە، لە قودرەت و دەسەڵاتی خۆت بۆ خزمەت بە گەل و نیشتمانت کەڵک وەرگرە و چینی چەوساوە ڕزگار بکە.

ئەی ئەو کەسەی سەروەت و ماڵت هەیە، بەسەروەتەکەت فیز و دەمار پەیدا مەکە و خێرخواز بە و یارمەتی فەقیر و هەژاران بدە.

ئەی ئەو کەسەی کە خاوەن عیلم و زانیاری، مەغروور مەبە، بە قەولی هەژار :

ئەو کەسەی کە دەخوێنێ پیت ونیوێ      خۆی دەچێتە کەل و گەل لە شێوێ

بەڵکوو دەبێ خەڵک لە گێژاوی جەهل و نەزانی ڕزگار بکەی و لە خەمی گەل دابی و کارێکی وابکەی گەل و هۆزەکەت لە کاروانی ڕووناکبیری و بەرەو پێشچوون دوانەکەون. خۆش بە حاڵی ئەو کەسە کە بێوچان و نەسرەوتن لە خزمەتی گەل و وڵاتی دایە، واتە بۆ خوابێ، بۆ گەل بێ و بۆ خۆی بێ.

خۆزگەم بەو کەسەی پیاوانە دەژی و پیاوانە دەمرێ و لەدوا مردنیش خەڵک بۆی دەگری و بەچاکی و پاکی یادی دەکەنەوە و دەبێتە سەرمەشقی مرۆڤایەتی بۆ گەل و هۆزەکەی و لەناو ئەلبۆمی مرۆدۆستاندا جێی خۆی دەکاتەوە و هەرگیزا و هەرگیز فەرامۆش ناکرێت، بە قەولی هەژار لە خانیەوە :

ئەوەی ماوە هەر ناوە بۆ پیس و پاک      بەدویانەوەیە تا هەیە ئاو و خاک
لکا ناوی بەدفەڕ بە سەد جوێنەوە      هەزار تووک و نەفرینی بە شوێنیەوە
بەشی پیاوی باش ئافەرین و نزان      لە خۆشی ژیاندان کە خۆش یان ڕزان

# .: بەشی ۱۰۰ :.

## سەرقەپاغێک لە لایەن عەبدوڕڕەحمانی ئەمینیان

به نیـوی خـوای یـەک تـەن　　　　که هەموو هاواری ئەو دەکـەن

بەڕێز کاک ئەمینی دەم بە پێکەنین، دیسانیش پێنووسی زێڕینی هاتەوە گەڕ و پەڕتووکێکی پڕاوپڕ لە نوکتە و وتەی خۆش و لە جۆشی هێنایە سەر لێنووس و دیبەری دڵی سیرۆشی بە نمنمی بارانی وتە خۆشەکانی تێراو کردین.

ڕەنگە هەموو ئەو کەسانەی کە ئاگاداری ڕەوانناسی و دەروونناسین، لەسەر ئەم ڕاستیە کۆک بن کە نوکتە و بەسەرهاتی خۆش وەک موزیک و گۆرانی و دەنگی خۆش، دەروونی هەموو مرۆیەک دەگەشێننەوە و دڵی خەولێکەوتووی خەم و تەم دەبووژێننەوە. دەروونناسان و پسپۆڕانی باری دەروونی لە ئیبنی سیناوە هەتاکوو پستالۆزی و مان بە گوفتار دەرمانی و لاواندنەوە و دڵشاد کردن، نەخۆشییەکانیان چارەسەر کردووە. ئاو و سەوزایی و دیمەن و چیمەن و قسەی خۆش بە ڕاستی لادەر و لابەری هەر لاوازیەکی دەروونن و هەتوان و چارەسەرکەری هەموو خەمی کوێستانی پڕ لە تەمی دڵ و دەروونی مرۆون. بۆیەش (ئەمین) بە هەست کردن بەم مەبەستە زانستیە و دەروونناسانەوە دەستی پڕ هەستی داوەتە پێنووس و چەن ڕووداوێک و نوکتەی خۆش و ئاودارمان بۆ دەگێڕێتەوە و ئێمەش لە پەڵە پێکەنینی بەشدار دەکات و بزەش دەدات بە خەمەکانمان.

ئەمین بە نووسینی کتێبە بە پێز و هێزەکانی کە بە ڕستە جوانەکانی شێعر و هەڵبەست ڕازاونەوە لێزگەی بەرمووری پڕ نووری نیشتمان و ناوچە ناسینمان بە دڵی هزر هەڵداوەسێ و ئێستاش بە قسە خۆشەکانی شەپۆلێکی پێکەنین بە زەریای دەروونی هەر خوێنەرێک و بیسەرێکدا دەکات، بۆیە منیش کە هەر دەم خولیای قسە و نوکتەی خۆشم و لە هەر هەوارێک کە بە بیژانی نوکتە برازێتەوە ڕەشماڵم هەڵدەدەم و کۆڵی خەمم دەنێمەوە و تاوێک بە شنەی وتەی ناسک و پڕ ناوەڕۆک جەستەی ماندووم دەحەسێنمەوە و بە بەرامەی قسەی خۆش مێشکم دەگەشێنمەوە، ئەوا دەستم دایە پێنووس تا لە گۆڕەپانی لێنووس، سپاسی خۆم ئاراستەی کۆشکی دڵی (ئەمین)ی پڕ ئەوین کەم و بڵێم بە ڕاستی ئەمین ئەمجارەش وەک جارانی دی

باشی سیرەت لێگرتووە و مەبەستت چاک پێکاوە. ئەم هەنگاوەشت بەرەو هاوینە هەواری فشقیات و قاقای پێکەنین باش هەڵێناوە. پەنجەی پڕ گەنجت و هزری تیژ و بیری وردبین و لێوی بزە لە سەرت و پێنووسی جوانـنووست، هەر لە گەڕ و گوڕدابێت. هیوادارم کەمتەرخەمی مەمانانیش پڕ کەیتەوە و بە وتە خۆشەکانت هەروەها سەرخۆش و دڵ بێ پەرۆشمان کەیت.

با یادێکیش لە قسە خۆشەکانی ناوچەی سەردەشت وەک کوێخا عەولا و مام حەسەن و شێخ رەئووفی بێژوێ و کاک خدری شێرانیە و مەلا سەعیدی سنجوێ و مام قوربانی بێورێ و حەماغای لیلانێ و مام رەسواغای جبەرەندی و مەلا خدری دارمەکۆنی (حەمەد هۆمەری) و میرزا مەمەندی سەردەشتی و مام رەسوو و کوێخا حەسەنی هەڵوێ و هەموو ئەو کەسانەی کە لە رابردوودا دڵی خەڵکیان شاد کردووە بکەین و بڵێین رەوانیان شاد بێت و خوای گەورە بەهەشتیان بۆ بکاتە کۆشکێکی تا سەر.

کاک ئەمین، برای هێژا، خوای گەورە تەمەن درێژت کات تا لەسەر ئەم کارە بە نرخە و ئەم ڕێبازە دڵبزوێنە، هەروا سوور و پێداگربێت و کەشکۆڵی کوردەواری دەوڵەمەندتر بکەیت.

خوێنەرانیش بە دڵنیاییەوە گوڵبارانی دوعای بە خێرت دەکەن کە زمانی خەڵک قەڵەمی خوایە و گەورەی بێ گەورە هەر ئاگادارت بێت.

ئـــەمین نوکتـــەی خـــۆش دڵ باوەشـــێنە<br>بـــۆ هـــەموو کەســـێ دەروون گـــەشـــێنە

هەرکەس عادەت کات بە قسە و نوکتەی خۆش<br>دالانـــی دڵـــی شـــادە و بـــێ پـــەرۆش

برات : رەحمان – خەرمانانی ١٣٨٩ی هەتاوی – سەردەشت

**بەرهەمەکانی نووسەر سەرجەم بریتین لەمانە :**

١- بەهەشتی کوردستان

٢- گەشتی کوردستان

٣- تەجویدی قورئان

٤- کەشکۆڵی عەداڵەت

٥- پێپێچەی چواران

٦- پوختەیەک لە مێژووی کوردستان

٧- خەمڕەوێن

٨- ئاسۆی ئەدەب

٩- خورجێنی ئەوین

١٠- دیاری بۆ هۆگرانی قورئان

١١- ناوە پیرۆزەکانی خوای مەزن

١٢- شیعر لەسەر پەڕتووکی دیمەنە جوانەکانی سەردەشت

خەمڕەوێن

بڕای بەڕێزم چاو مەقونجێنە — لەناو جەماوەر خۆت بگونجێنە

لە کوڕ و کۆمەڵ کش و مات مەبە — یار و هاوەڵی لات و پات مەبە

خەم بڕەوێنە لە کوڕ و کۆمەڵ — بووکی شادی بە و مەبە بە کۆتەڵ

بۆ هەر مەقامێ نەقڵی بە کەڵکە — پیاوی گرژ و تاڵ وەک گەڵای پەڵکە

جەفەنگ و شۆخی لەگەڵ نەقڵی خۆش — لابەری خەمن مرۆی خاوەن هۆش

ئەمین قسەی خۆش میوەی بەهەشتە — گوڵی سەرچڵی باخی سەردەشتە

بەهەشتی کوردستان

گەشتی کوردستان